ناوی کتێب: دیوانی صابری

بابەت: شیعر

شاعیر: شێخ نەجمەدین (صابری)

سەرپەرشتیاری چاپ: عبدالجبار البرزنجی

چاپی: چوارەم ٢٠١٧

چاپخانەی: تەژنە

تیراژ: ١٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردنی ( ١٣١٦ ) ساڵی ( ٢٠١٧ )ی پێ سپێردراوە

لەسەر ئەرکی کتێبخانەی (الحفید) چاپکراوە

# دیوانی صابری

نـــامی دڵشادە بەم نــامە بـەرزە
کە مایەی هێزی عەقڵی سەر ئەرزە
قەدر و حورمەتی نـامەی صــابری
بە روح و بە دڵ لـە سەرمان فەرزە

مەلا عەبدولکەریمی مودەریس

# پێشەکی چاپی چوارەم

بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

لای هەموان ئاشکرایە کە صابری ویستویەتی شیعر لە خزمەت ئاین و چاکەکاریدا تەوزیف بکا وە لەڕێگەی شیعرەوە دەیەوێت ئامۆژگاری نەوەکان بکات کە نابێ لە پێناو پۆستو پایەدا ئاینی خۆیان لەدەس بدەنو بە شوێنی دونیا بکەون، واتە پەیامی شیعر لای صابری دەبێ لە خزمەت ئاین و نەتەوەدا بێت.

بۆیە پێمان باشبو وە بە پێویستمان زانی چاپی چوارەم بۆ دیوانی صابری بکەین چونکە چاپی سێیەم نەکەوتە بازارەوە بەڵکو (بەڕێوەبەرایەتی چالاکی وێژەیی سلێمانی) خۆیان هەستا بە دابەش کردنی بە سەر ناوەندە ڕۆشنبیریەکانی کوردستاندا.

لەم چاپەیشدا دیوانەکە وەکو خۆیەتی تەنها گۆڕانکاریمان لە پێڕستی ناوەکانو شوێنەکانا کرد بە گواستنەوەیان لە کۆتایی دیوانەکەوە بۆ هامشی شیعرەکان.

وەسوپاسی (کتیبخانەی الحفید) ئەکەین لەکەرکوک کە بەم کارە هەستا.

عەبدولجەبار بەرزنجی

کرکوک/٤/٣/٢٠١٧

به‌ناوی خودای به‌خشنده و میهره‌بان

## صابری وا ده‌ناسرێ

به پێنووسی کوڕی صابری

ئه‌حمه‌د شێخ نه‌جمه‌دین

صابری (شێخ نه‌جمه‌دین کوڕی شێخ عه‌بدولڕه‌حمان به‌رزنجی)ه، دانیشتووی دێی شۆریجه‌یه، نه ناسراوه له ژیانیدا، تاکو ئه‌مڕۆش وا ده‌رده‌که‌وێ که حه‌قیقه‌تی نه‌زانراوه و حه‌قی نه‌دراوه‌ته ده‌ست.

صابری زۆرێکی ئه‌وتۆی نه‌خوێندبوو، به‌ڵام زۆر زیره‌ك و تێگه‌یشتو بوو، دوور بین و قووڵ سه‌یرکه‌ر بووه، صابری باوه‌ڕێکی زۆر به‌هێزی به‌خۆی هه‌بوو، چونکه قسه‌ی نه‌ده‌کرد ئه‌گه‌ر به ته‌واوی تێبینی نه‌کردایه و ئه‌م لاو ئه‌و لای شته‌که‌ی لێکنه‌دایاته‌وه، هه‌نگاوی نه‌ده‌نا ئه‌گه‌ر پێی له‌سه‌ر ئه‌رزێکی ڕه‌ق گیر نه‌کردایه، هه‌روه‌ها صابری به جه‌سارە‌ت و بێ باك بوو، بێ ترس و له‌رز و سه‌ربه‌ست بوو، صابری دوور بووه له عه‌قڵیه‌تی سست و په‌شۆکاو و چاولێکه‌ر و پاشکه‌وتوو، که زۆربه‌ی مه‌لایان و خوێنده‌وارانی زه‌مان تووشی بووبوون، صابری به‌دڵی نه‌نووستوی و ڕوحی ڕوون و به‌رزی، حه‌ق و ناحه‌قی هه‌ر زوو له یه‌ك جیا ده‌کرده‌وه و قسه‌ی خۆی ده‌کرد، وه‌کو ڕم (رمح) جه‌رگی زوڵمی کون ده‌کرد، وه‌کو گولله‌ی پێنج تیر ئه‌ینایه که‌لله‌ی ڕه‌قی بێدینی بوغڕاوه.

- صابری ئه‌گه‌ر چی ( ته‌ریقه‌تی قادریی)وه‌رگرتبوو، به‌ڵام دوژمنی شێخی ڕیش شانه‌که‌ر و عه‌سا چه‌ورکه‌ری دڵ بێ خه‌به‌ر بووه، دوژمنی شێخی خۆپه‌رست و ڕه‌وشت گێڕ و که‌م "ته‌قوی"و عه‌قڵ بچووك و خۆ به‌رز دیوو نه‌فس نزم بووه، صابری ده‌یزانی که پیاوی چاکی (ته‌ریقه‌ت) به مێزه‌ری سپی " کفنی " سپی یاد ئه‌کا، و له ترسی قیامه‌ت له دونیا دا ناحه‌سێته‌وه، تا وه‌کو له وێدا "ڕووی سپی "بێ" ئه‌م سێ (٣) ڕه‌نگه سپییه پێکه‌وه ڕێکن، به‌ڵام دوای خۆیان ئه‌گه‌ر نه‌وه‌کانیان ئاڵانه خانووی گه‌چی سپییه‌وه و کراسی نایلۆنی سپییه‌وه، و (قه‌مه‌ره)ی ڕه‌ش و سپییه‌وه، که به ماڵی هه‌ژاران ده‌یکڕن، ئه‌م

ڕەنگە سپیی و ڕەشانەی دونیا لەگەڵ تاریکی دەرۆن و مردنی دڵدا، دەبنە هۆی ڕەشی ڕوو ڕۆژی قەیامەت.

صابری ئەگەر چی بەعەقڵ و دڵ و ڕوحەوە "حەقیقەت"ی (تەصەوف) چەشتبوو، بەڵام دوژمنی بەرگی چڵکن و پرچی ژاکاو و ڕەوشتی بێ وقار و هایو هوی بێ فەڕ بووە:

**هەرکەسێ نەفسی شکانی سنگ و مێخ**

**های و هیو و تەپڵ و دەف نایکاتە شێخ**

صابری زۆر لە دەروونەوە ڕوناک و بووژاو بووە، زوو (دەرک)ی بە گۆڕانی زەمان کردووە.

صابری قەت پاشەکەوتی نەدەکرد، هەرچی بووایە سەرفی دەکرد، بەڵام لە جێی خۆیا، هەر کاتێکیش نەیبووایە نان و ئاوی سەردی دەخوارد و دەریەست نەدەهات.

صابری زۆر ئێش گەیشتە جەرگی و هەناسەی سەردی کێشا، کاتێ دیی و بیستی بە چ جۆرێك نەوەکانی خانەدان و ڕۆڵەکانی پیاوە گەورەکان یەکاو یەك لە گەڵ ئینگلیز هات و وڵاتی ئیسلامی داگیر کرد وەکو (عەنکەبووت) دەواری بێ دینیی هەڵدا، ئەم نەتەوەو ڕۆڵەی خانە دانان و پیاوە گەورەکان قورئانیان شاردەوەو بەرماڵیان پێچایەوە، خوانی (عارەق) و قوماریان ڕازاندەوە لە ( مەجلیسیانا )، صابری ئاواتی ئەوەی ئەخواست کە موسڵمانان بگەڕێنەوە بۆ ڕێگای هەق و ڕوو بکەنەوە خودا،دەس بگرنەوە قورئان و پێغەمبەرەوە، تەوبەی ڕاست بکەن، بانگیانی ئەکرد بۆ فڕێدانی هەموو بیرو باوەڕ و ڕەوشتی کافری بێگانە، وا هێنایە وڵاتی ئیسلامەوە و موسڵمانانیشی لە بەر نەفامی و نەزانیان پێ هەڵخەڵەتاند داخی گرانم.

صابری دەڵێ:(هەق وتن قانوون نییە، ناهەق وتن بێ شەرعییە)،

صابری دەڵێ: (دینی موسلم وا لە بەر شێتی و نەزانیمان نەما )، یاخود دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **موسڵمانان موسڵمانان** | **نەمانزانی نەمانزانی** |
| **خەزێنەی دینی خۆماندا** | **بە جیفەی عالەمی فانی** |

صابری زۆر مامۆستا مەلا ئەحمەدی گەورەی فەرقانی خۆش ئەویست و زۆر ئێش گەیشتە جەرگی بە شەهید بوونی.

صابری قەت ئیدعای کەرامەتی بۆ خۆی نەکردووە، ئەگەر چی "فراسە"تی ئاشکرا بووە.

صابری رق و قینی لەو کەسانە بووە کە دەسیان رۆیوەو دریغییان کردووە و سەرفیان نەکردووە و نعمەتی خودایان شاردوەتەوە کە خودا پێیانی بەخشیوە، باسی یەکێ لە وانەی کردووە و وتویەتی :"هەر لە گرانیەکەوە تاوەکو ئەمڕۆ بایی دوو روپییە کە دەکا( ١٥٠) فلس کەوای لەبەر نەکردووە ".

صابری لە جێی خۆیدا قسەی خۆی دەوەشاند، لە جێی تیژا بە تیژی، لە جێی نەرما بە نەرمی، مام حاجییەکی پیر رۆژێ تێکەڵ ناو شەڕ بوو بوو، لە ژێر عاباوە دەستی دەرهێنابووە دەرەوە، دەستی کردە شەرە پەل ، دوای ماوەیەکی دیکە (صابری) مام حاجی بینی بە دوای بزنە شەلێکەوەیە، صابری وتی :

رۆژێ بە گەرمی لە ناو شەڕە پەل
رۆژێ بە نەرمی لە دوای بزنە شەل

مام حاجی وتی :"یا شێخ چی بکەم ".

هەروەها صابری شیعری وتووە بۆ ئەوەی :

١- ئەم بارە گرانە و ئەم ئێشە سەختە لە دەروونی بهێنێتە دەرەوە و دڵی بحەسێتەوە.

٢- تاوەکو بیرو باوەڕی بۆ عالەم دەرخا و بڵاوی بکاتەوە بۆ پاککردنەوەی دەروونیان و راستکردنەوەی رەوشتیان.

٣- بۆ ئەوەی ئەم میراتییە بە نرخەی بە جێبهێڵێت بۆ ئەو کەسانەی لێی تێدەگەن، وەکو صابری دەتوانن بازبدەن بەسەر تەماعی دونیادا و سەر هەڵبڕن ۆ بەرەو ئاسمان بەرز سەیرکەن.

ئیتر من هەرچەند بدوێم تەسکینی دڵم نایەت و هەقی صابری ناتوانم بدەمە دەست مێژوو، مەگەر خودا هەر خۆی خەڵاتی بکا، خودا لە گوناهی خۆشبێت و لێی رازیی بێت و رازیی بکا.

بەغا ١٩٦٩/٢/٢٦

**به ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان**

# سەرەتا

صابری: ناوی شێخ نجمەدین کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانە، کوڕی شێخ مەحمودی قوتبی شۆڕیجەی (قەرەحەسەن )ە، جەنابی شێخ مەحمودی قوتب دانەری کتێبی ( بحر الانساب)ە کە بە راسترین سەرچاوە دادەنرێ بۆ مێژووی سادات.
صابری : لە ساداتی بەرزنجەیە،لە ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی بەرامبەر بە ١٨٨١ی زاینی لە دێی شۆڕیجەی " قەرەحەسەن "هاتوەتە دونیاوە، ئەم دێی شۆڕیجەیە سەر بە پارێزگای کەرکوکەو صابری لە نەوەی شێخ محێدینی قوولەیە کە مەرقەدی ئێستا لە گۆڕستانی ئیمام قاسم لە کەرکوك نێژراوە، لە تەمەنی ١٨ساڵیدا ژنی خواستووە.
صابری : ئەگەر چی فەرموویەتی کە پلەی خوێندنم زۆر بەرز نییە، بەڵام بەهرەیەکی خوایی بووە،زیرەکی و فراسەتی زیادی ( فوق العادە) ی هەبووە، بە چوار زمان شیعر و هۆنراوەی وتووە، بە کوردی، فارسی، عەرەبی و تورکی، بەڵام داخی گرانم لەم دیوانەدا بەشی عەرەبی بڵاونەکرایەوە، لەبەر ئەوەی بەردەستمان نەکەوت، هەروەها زۆربەی شیعرەکانی لەناو چووە و بەردەستمان نەکەوتووە، بەڵام ئەمە بەشە زۆرەکەیەتی.
صابری: لەپاش ژنهێنان چەند ساڵێك لە دێی شۆڕیجە دەبێ و بە فەلاحەتییەوە مەشغوڵ دەبێ و سەرپەرشتی دێیەکە دەکا،جارجار شێخایەتی و ئیمامەتی دێیەکەی دەکرد، لەناو خەڵکیشدا بە زاتێکی دەم و نەفەس موبارەك مەشهور بووە، زۆریش ئاگاداری بووە لە پزیشکی، عالەمی ئەتراف زۆر بە عەقیدەیەکی ساف و پاکەوە روویان تێکردووە و لە هەر چوار لای وڵاتەوە سوودیان لێ وەرگرتووە.
صابری: تەریقەتی قادریی بووە و زۆریش ئاگاداری شەریعەت بووە، بەیعەتی بە کەم کەس داوە چونکە کەم کەسی بەگەن کردووە لە عیلمی (تەسەوف)دا، لە شیعرەکانیدا دەردەکەوێ کەوا دەستێکی باڵای هەبووە، وەکو دەفەرمێ:

**(صۆفی )ئەبێ لەوحی دڵی سادە و سپی بێ شوبهی (بط)**

**ئەوسا رموزی مصحفی رووی یاری تەفسیرکا بە (خط)**

یان دەڵێ:

هـایی و هوویی و پرچ و ریش و تەپڵ و دەف بێ حاسڵە

حوسنی نییەت و عەمەل تەوبەی نەصووح ئەتکا خەلاص

صابری: لە گوفتار و شیعرەکانیدا دەردەکەوێ رەوشتی شـەرعیی بووە، ئـەهلی شـەرع و خواناس و پیاوی راستی خۆشویستووە، چونکە خۆی زۆر بێ تەماح و راست و بـە غـیرەت و چاوتێر و دڵ فراوان و نەبەز و مـەزن و بـەڕێز بـووە، لـەناو عەشـیرەتی بەرزنجـەدا و لـە هەموو ناوچەکەدا قسەی رەواجی بووە، لێرەدا بەو کەسـانە دەڵـێ کـە بیانـەوێ بەڕاسـتی رێگەی خودا بگرن:

ئەی دڵ ئەگەر بەڕاستی ئیتاعەتی خـودا دەکەی

موتابەعەی شەریعەت حەزرەتی مصطفی دەکەی

صابری: وا دەرئەکەوێ کە زۆر زانایی هەبووبێ لە تـەریقەتدا وەکو لێرەدا دەفەرمێ:

تەسوییەی خاشاکی رێگەی دین نەکەی بێ حاسڵە

خۆ بە بەیداغ و عەلەم نابیتە شێـخ و پێشەوا

یان دەڵێ :

( لیــس للانسان إلا ما سعی ) " صابــــر" وەرە

هیمەتێکە گەرچی بــوویە کۆتری بێ باڵ و پــــەڕ

هەروەها دەڵێ:

ئــــەگەر خۆ تۆ خودا ناسی وەکو ماسی کەڕ و کاسی

وە ئـیــلا وەك سەگی پاسی چییە ناڵان لە دەر ماڵان

یان لێرەدا چەند بە جوانی دەڵێت:

تا دەروونی دڵ لە نەقشی " ما سوی" خالی نەکەی

نەقشی ئەللا لەو دڵە جێ ناگرێ ئەی جاهیدە

تۆ ئیجازەی زکری بێ دەنگی لە ماسی وەرگـرە

قیرە قیری شەو وەکو قورپاقە نـادات فائیدە

دووباره دەڵێ:

داخەکەم بۆ موئمنی ساغ و سەلیم و بێ ریا
زۆر کەبە دەس ناکەوێ لەم وەختە ئیلا بە شاز

صابری: بەم هەڵبەستانەیدا وا دەرئەکەوێ کەوا مەستی عەشقی حەقیقی بووە چونکە دەڵێ:

ئەی موستەعید دەرسێ لە علمی عەشق ئەگەر تەحصیل ئەکەی
یەکسەر علوم و دەفتەری ( أثنی عشر ) دەهاویتە شەت

لێرەدا دەڵێ:

صابری ئەڵبەتە لای ئەو چاوە دەرسی خوێندووە
بۆیە وا سەریەستە لەم بەر قاپییە بەم رادەیە

یان لێرەدا دەڵێ:

ئەی مودەڕیس تۆ لە دەرسی عەشق تحصیلی بکە
تا بەکەی "زید علی سطح" علی حەرفی جەڕە

وا دەردەکەوێ صابری لە عیلمی "لدنی" بەهرەوەر بووبێ هەروەکو خودا فەرمویەتی "و علمناه من لدنا علما" بۆیە دەڵێ:

عەقلت لە نحوا سەراب ئەکەی     حفظي کەلام و حەرف ئەکەی
بێ دەرسی عەشقت پێ بڵێم     علمێکە بێ حەرف و نوقەط

هەروەها دەڵێ:

کلیلی صابری قاپیی هەموو مەقصودێ هەڵدەگرێ
بحەمدلا با دەس گرتومە رەنجی خۆم بە با نادەم

صابری : لە شیعرەکانیدا دەردەکەوێ کەوا ناسکی خەیاڵ و تیژی بیر و وردی مەعنای زۆری تێدا بەکارهێناوە هەروەها جوانی وشەیش و جیناسیشی زۆرە هەر وەکو فەرمویەتی لەم شیعرەدا:

تۆ کەبابت گەندمێکی خوارد و خوا لێی خۆش نەبوو

تۆ کەبابت خۆش ئەوێ صابر خەسارەت ناکیە

لێرەدا وشەی( کەبابت)کە لە یەکەم جار بە مانای باوك هاتووە، لە دووەم جار بە مانای کەباب و تەماعی دونیا و ماڵ و داراییە، زۆر جناسێکی جوانە، یان دەڵێ:

کە ( لذاتی) لە زاتی شێخی دی زاتی شکا بـۆیە

کە صاحیب زاتە صابر هەر وەکو توتی سوخەن گۆیە

دووبارە دەڵێ:

تا نەهاتم بوو نەهاتی تا " تبین " بێ بە هات

تازە هاتی هاتنت " هیهاتە " بۆ دڵدارەکەت

بە راستی ئەم هەموو هات و نەهات و هەیهاتە کە هەمووی هەر لە یەکتری دەچن، لە مەعناشا جیان زۆر بەرز و پڕ مانایە یا ئەمە چەن قوڵ و پڕ مانایە: کە دەڵێ:

سونی غەمی تۆ گەنمی دڵمی بە تەلەفدا

نانی غەزەلم شامیدە بێ قووەت و بێ رام

لەم شیعرەدا کە جیناسی تێدایە دەڵێ:

بـمکوژە بەڵکو حەیاتی جـاویدانم دەس کـەوێ

چاك ئەچم بۆ چاکی چاکان چاك بە دار و سینە چاك

یان لێرەشدا چەن بە جوانی، بە رێکی، بە قوڵییەوە، پڕ مانایە کە ئەڵێ:

تا بە مغناتیسی چاوت ئاسنی دڵ جەزب ئـەکەی

روحی عالەم پەڕە کایە و تۆ میسالی کەهرەبی

لێرەشدا دەڵێ:

لە شمشێری برۆت ترسم نییە سەد جـار نیشانم دەی

لە ریشەی جەرگ و دڵ کالانی ئەو شمشێرە سەنعەتمە

دووبارە بە مانایەکی جوانتر دەڵێ:

نــەمامی قەدی تۆ بەڵکو هەمیشە تازەو تەڕ بی

وەرە جانا لە سەر ئەم دیدەی پاراوە بینێژە

ئایە چەن بەرز و بە قیمەتە کە دەڵێ:

تیری غەمزەت ڕۆستەم و بەهرامی کوڕی کرد ئەسیر

قەوسی ئەبرۆت بێ شك عاجز ئەکا سەعدی "وقاص"

لە بابەت چاوەوە دەڵێ:

چاوەکانی وا دیارە دوژمنێکی خوێنیە

تیری موژگانی بە تیژی خەنجەری قەزوینیە

ئەی ئەمە چۆن نەترسی و ئازاییەکە کە وا بە جوانی دەڵێ:

مەحاڵە عەندەلیبی دڵ بکا تەرکی گوڵی حوسنت

چ دەربەستە نیهایەت مەرتەبەی هەر سەربڕینێکە

جا ئەم جۆرە شیعرە جوانانەی صابری کە هەر وەکو ڕۆژ، ڕەوان و جوان بــووە وە فکـری هەر وەکو ئاوێنەی بێگەرد بووە و شۆڕە سواری نوکتە بێژ بووە، هەق بێژو هــەق پەرست بووە، راست گۆ و دڵ پاك بووە، راسـت گۆ و دڵ پـاکی خۆشویسـتووە، شـەیدا بـووە بـە نوری یەزدان،سەر قافڵەچی دوڕ ناسان بووە، مەلەوان بـووە لـە دەریـای مەعنـەویاتا هـەر وەکو دەفەرمێ:

دووڕ و گەوهەر کێ لە قووڵی بەحر و دەریا دەریەکـا

تا نەکەن تەرکی وجود و مامەلەك نەوعی غەواص

دەتوانین بڵێین شیعرەکانی لە سەر ڕێگەی هەق پەرستی و باوەڕ و ئاین و کۆمەڵایـەتی و عەشقێکی حەقیقەتە، ئامۆژگـاری و پەنـدە، پـەیڕەوی ڕێگـای راسـتی و رەوشـت باشـی و یەکێتی و نەفس بەرزییە، شەیدایە بە نوری پاکی ئیمان.

## صابری

صابری: باڵای نە کورت و نە بەرز بووە، چوار شانەو گەنم رەنگ بووە،چاو گەش و برۆ رەش و خۆش خوڵق و نوورانی بووە، رووخۆش و مەجلیس گەرم و بە شەوق بووە، هەمیشە دەم بە پێکەنین ونوکتە باز و حازر جەواب بووە، زۆر چاك فارسی زانیوە، جارێکیان قازی موسڵ کە زۆر دۆستی صابری دەبێ و خزمیشی دەبێ لە سەردەمی حکومڕانی ئینگلیزدا کە تازە هاتبوونە عیراق تەکلیفی لە صابری کردووە کە بە مانگانەیەکی زۆر لەو رۆژەیا ببێ بە وەرگێڕ (مترجم) فارسی، کوردی عەرەبی، بەڵام صابری تەکلیفەکەی قبوڵ نەکردووە، هەرچەندە پێویستیشی هەبووە بە ماڵ و پارە، کە گوایە ئەم ئیشە بە خزمەتکردنی ئینگلیز دەژمێرێ، هەروەکو رێبازی ژیانی لەم بارەیەوە وە لەم هەڵبەستەدا دەرئەکەوێ :

کڵاوی سەر دڕاوی خۆم بە تاجی پادشا نادەم
کەلاوەی دوکەڵاوی خۆم بە قەسرو گەنجی شا نادەم
بە خوێنی جیفە بەرگی زاهیدیی ئالودەکەم، شێتم
بە تەوفیقی خودا دینم بە دوو نان و عەبا نادەم

هەروەها تورکییەکی جوانی زانیوە، سەخاوەتێکی زیادی بووە، حاتەمی وەختی خۆی بووە، هەروەکو مامۆستا مەلا عەبدول مەجید قوتب زادە شیعرێکی بۆی وتووە لە پاش وەفاتیا کە لە کێلی قەبری لە دێی شۆڕیجە نووسراوە کە دەڵێ:

شێخ نەجمەدین عالی هیمەت و زهرا نەسەب
حاتەمی ئەهلی زەمان بود خاتەمی ئەهلی ئەدەب

بەڵێ هەروەکو سەخی بوو، ئەدیب و تێگەیشتوو بوو، هەمو کات میوانی زۆری هەبووە و زۆر لە پیاوە گەورەکانی ئەو کاتە سەریان لێ داوەو پێیان خۆش بووە پێکەوە کات بەرنە سەر، پیاوی وەکو پایە بەرزی خوالێخۆش بوو شێخ مەحمودی نەمر(مەلیك )، سەید ئەحەدی خانەقا، رەفیق ئەفەندی خادم سوجادە، مامۆستا ئەحمەدی رۆژبەیانی، سید

محەمەد جەباری، شێخ عەبدولکەریمی قادرکەرەم، شێخ سەعیدی گۆپتەپە و شێخ قادری گوللەنەبڕ و گەلێکی تر لە پیاوە گەورەکانی ئەو کاتە، هەردەم تەکیە و دیوەخانەکەی گەرم و بەجۆش بووە، لە مەجلسی خۆیدا کەم و زۆر چەند دانیشتو و موریدی هەبوبێ هەر یەکە لای خۆی وابووە کە رووی شەفەقەتی شێخ لەو لە هەموو کەس زیاترە، هەروەها شەفەقەتی وەك هەور وابووە وەکو باران کە لە هەموو شوێنێ هەور دەیبارێنێ بەو وێنەیە شەفەقەت و دڵسۆزی بۆ گشتی بووە، شەوقی وەکو رووناکی هەتاو بووە، هەر کەسی گرتبێ بێ غەم و کەدەر بووە، زۆر حەزی لە شتی فەرەحی دەکرد و بەرگی پاك وجوانی خۆش دەویست، حەزی بە سەیران دەکرد و گەڕانی جارجار هەبووەو گاڵتە و قسەی بە تۆکڵیشی دەکرد، پێش کۆچی دوایی بە چوار پێنج ساڵ ئەم شیعرەی فەرمووە:

پــایزی پیری پەیابوو نەوجەوانیمان نــــەما
نەوبەهاری عەیش و نۆش و کامەرانیمان نــــەما
شێری پیری دەست و پێی ئاسکی جوانی تێکشکاند
قووەتی سەر پەنجە و باسك و زرانیمان نەما

لە پاش ئەم شیعرە دووچاری نەخۆشی شەلەل بوو دەست و پێی راستی خوێنی تیا وەستاو زمانی گیرا، ئەگەر چی لە ناو خەڵکدا بە شەلەل دانرا، بەڵام لەم شیعرەی کە خۆی فەرموویەتی وا دیارەکە لە لایەن دەستی پەریانەوە تووش بووە، ئەم شیعرەی پێش نەخۆشییەکەی داناوە کە دەڵێ:

ئەز دەردی هیجرەت ئەی پەری گشتم چوو قەیس عامری
ئەز لەطمەی دەست پەری شد دەر لوای عاشقان

وامان بۆ دەرئەکەوێ ئەم هەڵبەستانە بەرامبەری کرد لە گەڵ نەخۆشییەکەی خۆیدا کە باسمان کرد لە سەرەوە، ئەم فەرموودانەیە، (خارق العادات)ە و کەرامانە، بەم نەخۆشییەوە ما، هەتا ساڵی ١٩٤٤ی زاینی لە رۆژی ١٢/٩واتە لەمانگی کانوونی یەکەم بەرامبەر بە ساڵی ١٣٦٣ی کۆچی لە ٢٣ی "ذی الحجه" کۆچی دوایی کرد، ئەمری حەقی بەجێهێنا هەر لە دێی شۆڕیجەی ناوبراو نێژراوە.

ئەم شیعرە لە لایەن مامۆستا عەبدولمەجید قوتب زادەوە بە مێژووی کۆچیدوایی دانراوە کە ئەکاتە ساڵی ١٣٦٣ی کۆچی :

گفت تأریخ وەفاتش یاری ئۆ عبدولمەجید

( شیخ نجم الدین عند الحق فی قصر رحب)

لە پاش خۆی نەوەی بە جێهێشتووە پێنج کوڕ (٥) و سێ (٣) کچ بوون، لە کوڕەکانی سیانیان ماوە، گەورەکەیان شێخ عەبدولڕەحمان کە بە ناوی باپیریەوە ناونراوە و جێنشینی خۆیەتی ئێستا لە دێی شۆڕیجەی قەرەحەسەنە لە ناوچەی کەرکەك

## زنجیرەی باوك و باپیرانی صابری

شێخ نەجمەدین "صابری"

شێخ عەبدولڕەحمان

شێخ مەحمود قوتب

شێخ عەبدولڕەحمان

شێخ عەبدولعەزیز

شێخ محێدین قووله(کەرکوك)

شێخ حەسەن گلەزەردە

شێخ محەمەد نۆدیی

شێخ عەلی وەندەرینە

شێخ بابا ڕەسووڵ

شێخ عەبدولسەیدی ثاني

شێخ عەبدولڕەسووڵ

شێخ قەلەندەر

شێخ عەبدولسەید

شێخ عیسا الأحدب

شێخ حوسێن

شێخ بایەزید

شێخ عەبدولکەریم

شێخ عیسا بەرزنجی

شێخ بابا عەلی هەمەدانی

**شێخ یوسف هەمەدانی (شهابەدین)**

شێخ محەمەد مەنصور

شێخ عەبدولعەزیز

شێخ عەبدوڵڵا

شێخ ئیسماعیل المحدث

ئیمام موسای کازم

ئیمام جەعفەر ئەلصادق

ئیمام محەمەد ئەلباقر

ئیمام زەینەلعابدین

ئیمام حوسێن کوڕی ئیمام عەلی

سیدە فاتمە ئەلزهرا

حەزرەت فەخری کائینات محەمەد

# پەسەند

به پێنووسی پایه بەرز و زانا

مامۆستا عەلادین سوجادی

ئەم کوردە، لە لاپەڕەی دەورانی مێژوویا، گەلێ ناوداران و خاوەن قەڵەم و خاوەن بەهرەی شیعرو هۆنراوەی تێدا هەڵکەوتووە، بەڵام لە بەر ئەوەی کە لاپەڕەی ئەو ڕۆژانەی بەرامبەر بە خۆی و بەرامبەر بە نووسەران و شاعیرانی لا پەڕەیکی نەهاتیی بووە، بە نەمانی کەسەکانی قەڵەم و چەشەکەشیان لە بیر چوونەتەوە و کارەساتی پێچەوانەی یەك لە دوای یەکی ناهەمواری هارپیونی.

ئەگەر ئێمە سەیرێکی نەتەوەکانی تر بکەین دەبینین مانەوەی ئەو نەتەوانە هۆی ئەو مانەوەیان زۆرتر بیری خاوەن قەڵەم وخاوەن چەشەی شاعیرەکان بووە،هەر ئەوان بوون سۆزی دەروونیان کەوتۆتە کار و سۆزی نەتەوەکەیان به زوبانی ئەو نەتەوەیە پیشانی عالەمی خۆیان و غەیری خۆیان داوە، کە ئەوان بەسەر چوون و ڕۆیشتوون پاش ماوەکانیان نرخیان زانیوەو گەلێ جاری وا بووە بەرهەمی ئەو نووسەر و شاعیرانەی خۆیانیان بە ناوی زێڕ نووسیوەتەوە، نووسیویانەتەوە چونکە مانەوەی خۆیان بە هۆی زوبانی نووسین و هۆنراوەی ئەو رابوردووانە یانەوە داناوە ئەو جۆرە شتانە و ئەو چەشنە دڵسۆزیانە کە نەتەوەکانی ترهەیانبووە و نواندوویانە، ئەو شتانە بۆ ئێمەی کورد داخی گرانم ڕێنەکەوتووە، لە بەر ئەم ڕێنەکەوتنە، گەلێ لە شاعیران و نووسەرانی ئێمە بوون بە ژێر لێوەوە و لە ژێر پەردەی تاریکی لە بیرچووندا لە بیرچوونەتەوە.

یەکێ لەو کەسانە کە هەموو جۆرە پەردەیەکی تاریکی کشابوو بە سەریا، خاوەنی ئەم دیوانە شێخ نەجمەدین (صابری ) بوو.

صابری : هۆنەرێکی گەلێ بەرز بووە، کە لە سەدەی چواردەی کۆچیدا هەڵ کەوتبوو، ئاوازەی شیعری بەرز و تەڕ وپڕ ماناکانی، نەوەك هەر لە چوار دیواری ناوچەکەی خۆیدا دەنگی ئەدایەوە، بەڵکو لە گەلێ لاوە ئەو دەنگە لە گوێی گەلێ کەسا ئەزرینگایەوە، ئەوەندە هەبوو سۆزی ئەم زرینگانەوەیە هەر لە کاتێکا بوو کە خۆی هەبوو، کە خەرمانی تەمەنی کەوتە بەر شەنوبای نامرادی و بەهاری ژیانی کەوتە خەزانی نەمانیی، ئەو سۆزەیش کپ بووەوە ئەمیش تایبەتی نەبوو بەوە وە بەڵکو زۆری وەکو ئەو بەر ئەو بایە کەوتوون، ئەمەش هەر لە بەر ئەو هۆیانە بوو کە هۆی تیاچوونی کەسانی تر بووە،

بەلام ئەبێ ئەوەش بزانین، کە شیعر خەیاڵە، خاوەنی ئەو خەیاڵە شاعیرە،صابریش شاعیر بووە، شاعیر نامرێ، کەواتە( صابری وەکو لە ژیاندا دەنگی هەبوو لە دوای ژیانیشی هەر دەنگی هەیە ). دەنگی هەیە، چونکە دەنگ لە شیعرەوە دێت، شیعریش گەلێ کێشەی هەیە، لە گۆڕانی ئەو کێشان ئەم دەنگانە دەگۆڕێن، شیعرە کانی صابریش چوونەتە ناو ئەو کێشانەوە، کە وا بوو صابری لە باتی دەنگێك گەلێ دەنگی هەیە، چونکە گەلێ شیعر و گەلێ لە کێشی شیعری هەیە، جا لە بەر ئەمە ، ئەو شیعرو دەنگانە ئەوەندەی تر ئاوازیان پەیدا کرد، ئەدەبی کوردی لەم رووەوە پلەیەکی تر پێش کەوت بەم دیوانە نایابە، ئەمەش لە بەر ئەوە چونکە ئەو شیعرانەی ( صابری ) لە ژێر پەردەی شاراوەییدا، بە هۆی دڵسۆزی رۆڵەی پایە بەرزی کاك شێخ عەبدولرەحمانی کوڕی و گەنجی بەنرخی نەوەکەیەوە کاك حوسێن بەرزنجیەوە، بە هۆی کۆشش کردنیان بۆ کۆکردنەوە و لە چاپدانیان دەرچوو، بەم ئیشە گەشەیەکی تر پەیدابوو لە ناو کتێبخانەی ئەدەبی کوردیدا، هیوادارم وێنەی ئەم جۆرە دڵسۆزانە بۆ بەرژەوەندی ئەدەبی کورد رۆژ بە رۆژ لە زیادبووندا بن و چاومان پێیان روون ببێتەوە.

بەغدا/١٩٦٧/١٠/٣٠

# بە باڵا بڕین

بە پێنووسی زانای مەزن مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ( بیارە)

قەدری هەر ئەدیب و هونەرمەندێك بەوە دەزانرێ و هەقی خۆی بەوە دەسگیر دەبێت، کە ئەدەب و هونەرەکەی لە ناو دوو بەرگی کتێبێك، یا لە ناو چوار دیواری ژوورێکا راگیر نەکرێت، بەڵکو بکەوێتە بەردەستی خوێنەران و رەخنەگران و بیخەنە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەو گەوهەرەکانی بدۆزنەوە، یەکێك لە هۆ و ئەنجامەکانی دواکەتنی ئەدەبی کوردی ئێمەش ئەوەتە بەرهەمی بەشی زۆری ئەدیبەکانی لە سنوورێکی تەسك دەرنەچووە، ئەوە بوو بە مایەی فەوتانی و کوێر بوونەوەی ناوی خاوەنەکەی بۆیە پاراستنی بەرهەمی ئەو ئەدیبانە و لە چاپدان و بە خەڵك راگەیاندن هۆیەکی کاریگەرە، یەکەم بۆ زیندویی هێشتنەوەی یادی ئەو ئەدیبانە و دووهەم بۆ بەرز کردنەوەی پایەی زوبان و ئەدەبی کورد و ئامادەکردنی گەلی کورد بۆ ئەوە کە لە ناو هەموو گەلان شانازیی بە کەلەپووری ئەدەبی خۆیەوە بکات، ئەو هەوڵەی جەنابی کوڕی بەڕێز و خاوەن تەکیەی شۆڕیجە کاك شێخ عەبدولڕەحمان و گەنجی دڵسۆز کاك حوسێن بەرزنجی داویانە بۆ کۆکردنەوەی شیعرەکانی خوالێخۆشبوو شێخ نەجمەدین ( صابری ) کە یەکێکە لە شاعیرە بەرزەکانی وە ئەدیبە گەورەکانی دوا چوری ئەدەبی کۆنی کورد، هەوڵێکی پیرۆزە و شایەنی قەدر زانینە و هەنگاوێکی بایەخدارە بەرێگای راگرتنی یادی ئەو شاعیرە و بەرزکردنەوەی گەشەپێدانی زمان و ئەدەبی کورد دا، خودا بکا هەمیشە وێنەیان هەر لە زیادیی بێ، هیوام وایە ئەم دیوانە بەرزەیش قەدر و حورمەتی شایانی خۆی وەرگرێ لە ناو خوێندەوارانی کورد و ببێ بە هۆی چاو لێکردن بۆ بڵاوکردنەوەی پاش ماوەکانی تری دێرینمان.

بەغدا ۱۹٦۷/۱۱/۱۲/

## بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

بەیادی: جەنابی شێخ نەجمەدین صابری، بەبۆنەی دەرکەوتنی دیوانی پاك و موبارەکی چەند وشەیەك:

بە دڵێکی پڕ لە جۆش،جۆشی ئەدەب و شیعر و فەلسەفە و ستایش و لێکدانەوەی دین و دونیایی لە بارەگاهی ئەم مەقامی پاك و پیرۆزە، کە تەکیەی دێی شۆڕیجەیە کە لە خزمەت شێخ عەبدولڕەحمان (یحی الدین ) نەجلی پاکی خاوەن ئەم دیوانە، هیوام وایە لە یەزدانی پاك، بۆ خاتری خۆشەویستی خۆی "محەمەد" دروودی خوای لە سەر بێت فەخر المرسلین یەکەم، دووەم بۆ خاتری ئەم مەقامە بەرزە ئەم عومر و ژیانەی کە لە مەولا لە سەرمان تێپەڕ دەبێ، روو لە قاپی خوا بکەین و لە هەموو چەوتی و گێڕی و کۆسپی دونیا لا بدەین، بە رێگەیەکی راست و بە دڵێکی ساف یەزدان بناسین، بەشکو لە رۆژی دوایی پەشیمان نابین، بە سەر بڵندی وەڵامی خۆمان پێدەدرێتەوە، ئامین.

# تەقریز

بارك الله " صابری" لەم روحی پاك و خەلعەتـــە
لێت موبارەك بێ موحەقەق مەسکەنت ناو جــەنەتە

مەدح و ئەوصافی شعورت هیچ زوبان پێی ناکرێ
شیعر و ئەبیات و قەصیدەت مەصدەرێکی حکمەتە

نووری قەلبت دەر ئەخا بۆ عالەمی ئەمڕۆ بـــەیان
گەر شعوری پێبکەین بۆ ئێمە عەینی فــرصەتە

گەوهەر و دوڕن هەموو ئەلفازەکانی خۆشی تۆ
نووری ئیمانە ئەگەر تێبگەن لە بۆ ئەم میللەتە

لائیقی خۆتە بەخوا هەرچەند بڵێی هێشتا کەمـــە
ئەم کەرامات و حەدیث و مـــوعجزات و ئایەتە

با لە دیوانت وەربیگرێ گەلێ کەس حیسەێ
بە شکو خوا رزگاریکا دەرچێ لە ناو ئەم زیللەتە

من بـــە مەحســوبانە وا تقرێضي دیوانت ئەکەم
"جاهدێکی "بێ نەوا مـوحتاجی لوتف و رەحمەتە

جاهد : برهان دۆغرەمەچی
١٩٦٧/٧/٢٢

# شێخ عەبدولڕەحمان

باسی شێخ عەبدەلڕەحمان نەجلی پاکی شێخ نەجمەدین " صابری " کە مەقامی موبارەکی لە دێی شۆڕیجەیە و جێنشینی جەنابی باوکیەتی و کوڕە گەورەیەتی :

## (ثە نا)

ثە نای ئەم تەکیەی مەعمەورە یاران

ئەنووسم بێ ڕیا بۆ خزم و خوێشیان

حەقیقەت شێخ و تەکیە وائەبێتن

نییە فەرقی گەداە و شاە و سولتان

هەموو وەك یەك ئەبینرێ لەو مەقامە

مەقامێکی گەلێ بەرزە بە قورئان

لە سەیری بەدری روخساری جەمالی

لە ئاسمانا مەلائیك بووەنە حەیران

لە رەحمان عەبدێکی وا موخلیس و پاك

نە بینراوە لەم عەصرە لە ئینسان

زوبانی شیرینێکی زۆر موعەتتەر

قسە و گوفتاری خۆشی عەینی دەرمان

کەرامەت هەم سەخاوەت هەم بەلاغەت

هەموو مەوزوونە لەم زاتە بە میزان

ئەگەر سەد خامە و دەفتەر لە لام بێ

بەشم ناکالە بۆ وەسفی لە مەیدان

تەریقەت یا شەریعەت یا نەسیحەت

وەرە لەم شوێنە وەربگرە موسوڵمان

لە نووری شەوقی دێی شۆڕیجە ئەمڕۆ

مــەقالاتی شعوورم کەوتە جــــەولان

فیدای ئەم خاکە بێ سەد خاکی بێ گوڵ

بـــە قـوربــانی بــبێ ئێران و تـــــوران

دەف و دەروێش و شێخ مەستی محەمەد

هـەوا و ئاب و خاکـــی لـــوتفی یــەزدان

مـناجات و تەمەنا بۆ تـــەجەللا

لە قاپی صابری ئەڕواتە ئاسمان

رجام وایە منیش بەم شیعرە خۆشەم

کە رزگاربێ لە غەم جەمعی رەفیقان

نـەجاتمان بێ لە دەس زۆرداری زاڵم

بچوکتان شاعیری کورد ناوی بورهان

جاهد دۆغرەمەچی

**كلمة..!**

**لفضيلة الأستاذ عبدالمجيد القطب**

**مدير معهد الأسلامي و رئيس رابطة علماء كركوك**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

حمدا لمن جعل صدور الأدباء صحائف الحكم وشكرا لمن أذاقهم حلاوة التعبير المحكم، و الصلاة و السلام على سيدنا محمد الذي لا ينقطع نسبه ما أضاء النهار و الليل أظلم و على آله و صحبه صلاة و سلاما دائمين الى يوم يقال للظالم تقدم و للمظلوم قف و تحكم.

و بعد: فقد أطلعني الشاب النبيل الذي قلما يوجد في هذا العصر من له مثيل السيد حسين نجل المرحوم السيد عمر البرزنجي على ما خلفه جده السيد نجم الدين ( صابري) أبن السيد عبدالرحمن من أثر تأريخي منظوم الذي قارن فيه ما عليه المسلمون في عصره من الأنحلال الأدبي و العلمي والديني والأخلاقي والأجتماعي، و بينما كان المسلمون قبلا من التمسك بالدين و التحلي بالأدب و العلم و التخلي عن الرزائل الأخلاقية والأجتماعية بأسلوب طريف و تعبير قوي لطيف.

و الحق يقال أن الشاعر المرحوم غفر الله له كان من الأدباء البارزين المعروفين بمكارم الأخلاق والمتمسكين بآداب الدين و أهداب الأدب والعلم فلم يستطع أن يسكت عما يرى من التدهور السريع المريع خلال فترة قصيرة من عمره الطويل، فنظم كلما رآه في عصره من أنحراف المسلمين عن الصراط المستقيم، فعبر بمختلف اللغات، الكوردية، العربية، الفارسية و التركية تعبيرا عن واقع الأسلام

و المسلمين خدمة للدين والتأريخ و الأنسانية، وكان بيني وبينه رحمه الله صلة ( المودة في القربى ) مودة روحية كبيرة الى أن أنتقل الى رحمة الله.
و حيث أن تأريخ الأدب يحتم على أهله أن يحترم أهله أمسكت القلم لأعبر عما في قلبي تجاه فراقه الأبدي من ألم ألم بي كان رحمه الله ممن درس عند والدي مدة من الزمن و بعد أن أذاق قسطا من حلاوة العلم والأدب، ترك مخالطة الناس و قضى أكثر حياته بالبر والتقوى و العبادة و مساعدة المستضعفين في الأرض بقدر ما يسمح له الدهر، و لايزال يدعو الى سبيل ربه بالحكمة و الموعظة الحسنة( و يجادلهم بالتي هي أحسن ) أقتفاء بسيرة جده (ρ)، المأمور بتلك الطريقة المثلى، و في الحقيقة والواقع كان رحمه الله نجما من نجوم الأدب اللامعة و علما من اعلام السجايا المرضية طول حياته.
و يقاسي من شدائد الدهر ما لا يقاسيه كل أنسان ( صابر)على المكاره التي تعتريه في الحياة أمتثالا لقوله تعالى :" وأصبر و ما صبرك ألا بالله " فأرتأى لقب (صابري) وأرتضاه لنفسه أشعارا بأن يحذو نسله المبارك حذوه في الصبر و الثبات و لسان حاله يقول:" ولئن صبرتم فهو خير للصابرين " غفرالله له وتغمده في جنة النعيم.

## سەرگوزەشتەی ...صابری

نتیجەی " أفكار" و ئازاری دڵی زامار و بیمارم بە برادەرانی خۆم بڵێم : یا خودا لە یاری
بێ وەفا و ڕۆژگاری پڕ جەفا تووشی دەردی سەر و زەرەر نەبن....*
"ئامین." *

و بعد : داعی کە نەجمەدین وەلەدی سید شێخ عەبدولڕەحمان نەجلی سید شێخ مەحمود
بەرزنجی قەرەحەسەنی شۆڕیجەم، غفر الله لهم و لنا ولسائر المسلمین."ئامین ".
تەوەلدم (١٣٠٠)ی هیجری بووە، لە تاریخی (١٣١٤) ی هیجری باپیرم شێخ مەحمود
وەفاتی کرد و باوکم لە ساڵی١٣١٨ی هیجری وەفاتی کرد، ئەو ساڵە لە پاش وەفاتی
باوکم، ( تأهل )م کرد، ژنم خواست، بە فەلاحەت مەشغول بووم لە دێی شۆڕیجە، حاڵێکی
(مناسب) م پەیداکرد، (أعتبار)ی زۆر بە ( أمر)ی قادری بیچون گەردونی دوون پەروەر
بەقانونی ( سەفەر بەر) ماڵ و حاڵی وێران و پەرێشان و خۆشمی رووت و زەبوون کرد
( أنا لله و أنا أليه راجعون )، لە ساڵی گرانی بە ئاسانی چوومە ( دێلێژە) چونکە هەموو
شێخانی دێلێژە خزم و ئەقرە با بوون مالا و بدنا..، ساعی و مکرم بوون خودا موعینیان
بێ زۆر موعاوەنەتیان کردم ( والحاصل ) ساڵی پاش گرانی کە ئەکا تأریخ لە هەزار و سێ
سەد وسی و حەوتی هیجری بوو (١٣٣٧) ، حب الوطن شەوقی کەوتە سەرم، ئارەزووی
گەڕانەوەم کرد بۆ دێی شۆڕیجە ، ڕۆژ بە ڕۆژ ئارەزووم زیاد ئەبوو، ناچار(أستدعا )و
(أسترحامم ) لە خزمەت مەرقەدی شێخ رەزای دێلێژە "قدس سره " کرد هەوای
نیشتمانم نەما غایەلەی شیعر دانان بە دڵما ڕائەبورد عاقیبەت لە هیمەت شێخ رەزا وە
زوو بە زوو هاتمەوە بۆ شۆڕیجە ئەما فکرم هەر لە سەر شیعر دەڕۆیی، هەتا ئێستاش کە
ساڵی ١٣٤٧ی هیجرییە، هێشتا نەتیجەی ونهایەتی نەهاتووە.

ئەگەر چی قووەتی " علم "و خوێندنم زۆر نییە، ئەما جار بە جارێ لە هیمەت و بەرەکەتی چاکانەوە شیعرم بۆ دێت،" هذا من فضل ربي "، " حمدا لك و الشكر لك يا ذا المنن "، ئەما رجام وایە بە چاوی مەرحەمەتەوە تەماشای بفەرموون چونکە " " تأثيرات "ی وەیشومەی سەردی پایزی مەیلی یاری بێ وەفا و تەشویشات و موهاجەمەی دەردی رۆژگاری پڕ جەفا باغ و بێستانی " ئەقالیم " و "بلدان " ی نیشاط و " أنبساط "ی دڵ وجانی بە نەوعی فەوتان و سوتان مەگەر رەحمەتی رەحمان و نەسیمی "جنان" تازەیکاتەرە.

لە پاش هەزار ئازار و زاری مار کە بەدڵی هەژارم گەیشت و چەشتی بە غەیری " صبر" چارەی نەبوو، ناووم " ملقب " بە " صابری " کرد شایەد جەناب " صبار " جەزای "صبر" – أحسان –بکات .. ئامین.

شێواوم وێنەی قەیسی عامری ‌‌‌‌‌‌‌ ناوم نەجمەدین لەقەب"صابری"

ئومێدم وایە ستار العیوب ‌‌‌‌‌‌‌ بداتە" صابر"سەبرەکەی ئەیوب

یا دڵ غەمگین بە وێنەی یعقوب ‌‌‌‌‌‌‌ عاقیبەت رۆژێ بگاتە "مطلوب"

صابری

* * * * * *

ئەم سەر گوزەشتەیە بە پێنووسی دانەرە، لە پێش وەفاتیا نووسیویەتی ئەوا بە بێ دەست کاری خستمانە پێش چاو.

# ( تکا )

تکـا لـه خوێنـدەوارانی بـەڕێز وخۆشەویسـتەکانمان ئەکـەم کـەوا بـە چـاوێکی دڵسۆزانەوە سەیری ئەم دیوانە بە نرخە بکەن، چونکە زۆر لە شیعرەکانی وەکو دووبارە وایە، یان هەندێ لە قافیەی شیعرەکان دووبارەیـە، بـەڵام هـەمووی هـەر جـەنابی صابری خۆی فەرموویـەتی، واتـە جـاری یەکـەم بـە مسـوەدە دایـنـاوە: لـە جـاری دووەم کـە ئەو مسوەدەیەی نەقل کردوە، گـەلێ شـیعری جـوانتر و ڕێکـتری بـۆ هـاتووە، واتـە نوسـخەی مسوەدەکەو نوسخەی پاکەکە هیچ بە یەکتری ناچن، تـەنها لـە هەنـدێ شـوێنا نـەبێ، جا لەبەر ئـەوە وامـان بـە چـاك زانـی کـەوا هـەردووکیان بنووسـرێنەوە، لـە بـەر ئەمـە تکای سەرنجی بدەنێ.

دڵسۆزتان نەوەی صابری

شێخ عەبدولڕەحمان بەرزنجی

## بۆ گەورەیی یەزدان

"حمد " ئەکەم بۆ "خالق"و پەروەردگاری ئینس و جان
وا بە لوتفی خۆی بە ئێمەی داوە " عقل"و دین و جان

ئەو خودا وا تاکو پاك و بێ شەریك و بێ غەمە
بێ نیاز و رازقی هەشتا هەزار نەوع عـالـەمـە

"فـرد" و بێ فەرزەند و زەن، هەم بێ وەزیر و بـاب و داك
واحدو بێ جسم و صورەت، هەم لە " نقص "و عەیب پـاك

خـەڵقی کـرد ( فی ستە أیام ) ئـەرز و ئـاسمان
هەم بەقودرەت ئەو محەمەد مصطفایی بۆ کرد بەجان

عالم و دانا بە ئەحواڵی هەموو خەڵقی جیهان
زەڕەیە ئەشیا بەبێ ئەو قودرەتی نابێ نیهان

جملە مەعلوماتی ئەهلی ئاسمان و سـەر زەمین
قەترەیە ئاوە لە بەحری عیلمی ( رب العالمین )

وەرگەڕانی ئاسمان و نووری خورشید و قەمەر
بۆ بەیانی قودرەتی ئەو شاهیدێکن "مـعتبر"

تۆ لە "حیسیات "و ئاموشوی نەفس نابی جودا
یەعنی چی تێناگەی "آثار "ی ئەسراری خـودا؟

ئـەو خودا وا ئادەمی خاکی وحەوای ئیجاد کرد
وا بە نووری مستەفا دونیاو (عقبا )ی شاد کرد

قودرەتی ئەو بوو محەمەد مانگی چواردەی کرد دوو نیم
قودرەتی ئەو بوو عەساکەی بوو بەمار(موسا)ی کـەلیم

قودرەتی ئەو حەزرەتی" نوح"ی لە تۆفان دا نەجات

بێ ئیرادەی ئەو نەبوو" عیسا"بە مردووی دا حەیات

قودرەتی ئەوبوو سلێمان عالەمێ تەسخیر ئەکا

ئاگری ابراهیم بە گولزاری "جنان" تقدیر ئەکا

قودرەتی ئەو یوسفی کردە" قوت "ی زیندان و بەشەر

"یونس"ی کە کردە" قوت "ی حوت و تاریك و کەدەر

قودرەتی ئەو دەست و پەنجەی تۆ قەلەم نزدیك ئەکا

قودرەتی ئەو رۆژی ما رووناك و شەو تاریك ئـــەکا

ئەی فقیە ئاساری فضلي ئەو نەبێ "تصنیف "ی چی؟

ئەی حەکیم ئەتواری لوتفی ئەو نەبێ تەعریـفی چی؟

قادر و عەدل و تەوانا هـــەرچی حەزکا وا دەکا

لـطف و قـــەهری عالەمێ ئاباد و یا "أفنا"دەکا

من ئەبێ چیبم لە فضلي بێ شوماری دەم بـدەم

یا بەیانی " معجزات "ی " أنبیاو الله " بـکەم

" صابر" م ناقص ترینی بەندەکانی حەزرەتم

کەمترینی پاسەوانی دەوری نان و "نـعمەت" م

# الله

بێ ئیرادەی ئەمرو تەوفیقی خودای " ذو الجلال"
ئیش و کاری هیچ کەس ناگاتە سەر حەدی کەمال

کەڕو وفەڕی جنبشی جملە وحوش و هەم طیور
هەر لە ئەوجی ئاسمان تاکو بیابان و "بحور "

ذی حیات و دار و بەرد و خاك و خۆڵ وئاب و نـــار
قودرەتی ئەو خەڵق ومەحوی گشت ئەکا لیل و نهار

یا خودا تەوفیق تا " منظومە"یە تألیف بکەم
عیلەت و ئازاری بێ دەرمانی دڵ تەعریف بکەم

بابمێنێ یادگاری دەردی "نەجمەدین نجل "
عەبدالرەحمان أبن شێخ مەحمود بەرزنجی ئەصڵ

کوشتمی ئـــــازاری زامی تیغی جـــەوری رۆژگار
باهەموو کەس تێبگا" أظهرمن الشمس "ئاشکار

هەر کەسێ گوێی هونەر دەرکا لە مەیدانی " مصاف "
بۆ سەری ئەو تیغی دەوران بێ غیلاف و بێ خـــیلاف

ذو الفقاری عەشق تیغی چەرخی دەوران کول ئـــەکا
حوسنی جانان دەرکەوێ کێ سەیری باغی گوڵ ئەکا

هەر کەسێ عەشقی حەقیقی بێ دەبێ پەروانەوار
خۆی نە پارێزێ لە سۆز و "أشتعال"ی شەمع و نار

هەر دڵ و جانە" نثار "ی خاکی پێی جانانەبێ
دوو گومانە "صابری " ئاخۆ قبوڵە یا نـــەبێ

# أللە

## ستايشى پێغەمبەر

### (صلى الله عليه وسلم)

خوا کە خەڵقی کرد حەبیبی خۆی لە نووری زاتی پـاك

ئەو زەمانە هیچ نەبوو " لا آدم و لا ماء "و خـــاك

عـــالەمی کردە (جسد )، نووری حەبیبی کردە رووح

بـۆیە وا هەر ماوە ناخنکێ بە ســـەد تۆفانی نـــووح

خـوا بە قورئانی موبین أفضالي ئەو ئــــەکا أثبات

کـــافیە شـــق القمر، میعراج و بـــــاقی موعجیزات

ئـــایەتی " ما ینطق عن الهوی "صـــابر چییە...؟

هــــــەرچی پێغەمبەر ئەڵێ بێ شك کەلامی رەبییە



Scanned by CamScanner

# دیوانی صابری

## پیتی ئەلف (أ)

### نەسیمی سوبحدەم

نەسیمی " سوبحدەم " موژدەی بەهاری حوسنی یاری دا
نیشانەی جـــەژنی نەورۆزی لە شاری دڵ دیـــاری دا
کـــە داخڵ بـــوو بە شاری دڵ سوپاهی حاکمی عـــادل
دز و جەردەی غــەم و (غصە) لە ترسی روحی غاریدا
(بحمـد الله)ســــــەفینەی دڵ لە گێژاوی بەڵا دەرچـــوو
ئیـــتر ئاسوودەیـــە بێ غەم لە بەحری لوتفی باریـــدا
نەما ئاساری غەیری حەق لە نێو شـــاری دڵم (مطلق)
کـــــە هەر کەس لێم قبوڵ ناکا خودا تەوفیق و یاریدا
نەما دەرد و غەم و میحنەت لە مەولا شادیە و عوشرەت
لە نێو بازاڕ و شـــاری دڵ (مبشر)هاتـــــوو جـــاڕی دا
وەرە (صابر) دڵ و جـــانت "نثار"ی پـــــایی دولبەرکە
نـــەوا بـــمری بـڵێن ئەو شێتە نەیزانی خـــەساری دا

## ئومێدی دڵ

دڵ بە ئومێدە کە شابی شان و شین خاڵی دەکا
مامەڵەی فەرشی حەریر و ئارەزووی خاڵی دەکا

باوەڕم نایە مەزەندە خۆی دڵی خۆی خۆش ئەکا
کوێر و کەڕ کەی تەرجمانی حەزرەتی والی دەکا

جاهیلی ئەبتەر (وصیت)بێ عەقیدەی پێ مەکەن
" صبر"ئەگەر بیخەیتە ناو هەنگوینەوە تالی دەکا

گەرچی ئەمرۆ مەرتەبەی ناکەس بلند و کەس نەوی
( کذب-ي محضه ) گەر بلێن عەللامە حەممالی دەکا

گەرچی مشکی و خامەك و ئەتلەس هەموو کاری دەسە
کوێری مادەر زادە کەی خورج و بەڕە و خاڵی دەکا

هەم نوشینی وشکە سۆفی قەت مەکەن نەفعی نییە
گەرچی (دائم )بەحسی شیعری مەولەوی و نالی دەکا

(صابری ) وریابە -أبناء-ی زەمان نزدیکە لێت
نەك بلێن ناشی سوارە روو لە جێی چاڵی دەکا

(صابرا) تۆ چیت بەسەر دون پەروەری دەورانەوە
گوێدرێژی خۆیەتی حەزکا بە گوێی نالی دەکا

## خودایە چ خۆشە

چ خۆشە کە روخساری جانان خـودایا ببینم فـــداکەم دڵ وجان خـودایا
چ شیرینە خەسرەو بە چاوانی پڕ خەو نەزەر کە لە راڕەو بە دەربان خودایا
غەریب و گـەدابم غەریقی بـەڵا بـم نەوا لەو جودابم بـەگریان خـودایا
بـریندار تـیرم پەرێشان (ضمیرم ) دەواکەی نەفیرم بە (أحسان ) خودایا
لیباسێکی چاکە خورشیدی حـوسنت بە (صابر) نیشاندەی زمستان خودایا
کە تانی وجودم بە (بدری )جـەمالی کە سووتا بسووتێ هەمیسان خـودایا
برینم بـە سـۆیە پەناهم بـە تـۆیە لـە چاوی نەخۆشی فرۆشان خـودایا
کە یار هات لەسەرخۆی منیش چووم لەسەرخۆم چـوو شـەبنم بـە خـورشید تابان خـودایا
نـەماوە سـەبووریم پـەرێشانی دووریـم کەرەمـکەی شفایە بـە قورئـان خودایا
لـە ناڵینی (صابر) چ جای حـەکیمـان چ بـوو وا جیهانـی خرۆشان خـودایا
وتی دیم لە شەودا شیفاکەم لە خـەودا نەکەی یاری (صابر) پەشیمان خـودایا

# دەردی دڵ

دڵ نەخۆشـــــە ئینتزاری هــاتنی دڵدار ئـــەکــا
مـــــەیلی سەیری میوەهات و سێبەری گوڵزار ئەکا

" رینا " ساتێ حەکیمی "حاذق" ی چـــاری بکەی
وەرنە دەرمان و دوعای بێ چـــارەکان کەی کار ئەکا

خۆشە سوتانم بە شەمعی روومەتی پەروا نـــــەوار
چونکە سفتەم دەفعـــی لەککەی ئاینەی دڵدار ئەکا

چـــاوەکەی بیماری دڵدارم مـــەگەر رەحمێ بـکات
وەرنە دەردم سەد چوو لوقمانی حەکیم بێزار ئـــەکا

تا ئەدیبی چاوی دەرسی (صبر) و حیلمی پێ وتــــم
دڵ لـــەبەر ئەو چاوە تەحمیلی هـــەزار ئازار ئـــەکا

یـــا خـــودا ئەم دەردە تووشی دوژمنانیشم نـــەبێ
چـــونکە " تأثیر "ی لە دونیا و قیامەت کـــار ئـــەکا

ئـــەی موسوڵمانینە جـــەللادێکە مانـــەندی نییە
هەریەیەك دەم سەد هەزار ئەکوژێت و زوو ئینکار ئەکا

ئـــەڵبەتە خـــاکستەری پێلازمە بـــۆ ئـــاوێنە
بـــۆیە ئـــەو دڵدارە بۆ سووتاندنم " أصرار " ئـــەکا

"طرفة العین " ی بـــە ناهەق سەد برینم لێ ئـــەکا
تیرەکەی ئـــاخر لە "أول" دەفعە چـــاتر کار ئەکا

دڵ هەزار ئازاری بینی یەعنی چـــــی خۆشحاڵە پێی
یار ئەبێ چی بیستبێ "یا رب "کە خۆی بێزار ئـــەکا

تا لە کن دوختۆری چاوی دڵ "وثیقە "ی وەرنــــەگرت

سەربەخۆ کەی عەزمی میوەی گوڵشەن و گوڵزار ئـەکا

" صابری، ألحمـدلله " یـار " وثیقة" ی داوە پـێی

سەربەخۆ هەر ئەمسەر و ئەو سەر لە نێو گوڵزار ئەکا

" صابری"بێ ئـــاردە باراشی غەمی نـــاکاتە ئـــاش

شەو وەکو عارەب – بە" بالله الكريم "– دەستاڕ ئـەکا

## پەیامێ بۆ موسڵمانان

ئـــەی مـــــوسڵمانان خودا لێمان قەبوڵ ناکا کـــەوا

وا بـــە جارێ دینی خۆمان نایە سەر نـــان و کـــەوا

حوببی دونیا زەوقی دینداری لە دڵمانا نـــــەهێشت

شەرمەزاری هەردوو دونیا تابیعی نەفس و هـــــەوا

تا بەکەی (عاصی) گەری و بێ تاعەتی دووری خـودا

بۆ تـــــەمێ نــــەگرین لـە بابا ئادەم و دادا حـــــەوا

یــــادی حـــەق و مـــــردن و ڕۆژی قیامەتمان نییە

(جملە)مــــعلولی گوناه و بێ حەکیم و بـــێ دەوا

ڕاستی دونیا هیچ وەفـــا و ئـــاســـایشی تێدا نییە

هــــــەرچی تێ فـــکرێ پەریشانە فەقیر و پێشەوا

دور لــــە چاکانی لـــە چارەی بێفەڕیدا سەد بەڵا

پادشاه موحتاجە بۆ دوو ئانە خـــــەرجی بێ نـــەوا

صابری ئەحواڵی ئەم دونیا مەگەر خوا چـــــاکی کا

تۆ مـــــەلێ عالەم وەها خەڵکی نەڵێ ئەو شێخە وا

# بێ قیمەتی دونیا

بـەس بکە مەیلی جهانداری لە دونیای بێ وەفـــا
نایەنێ ئەم قیمەتە کەم بۆی بخۆ جەور و جـــەفا
ساعەتێ فکری قیامەت کە کە سبحەینێ ئـەڕۆی
چی ئەکەی جوابت چییە تۆ چی ئەڵێی لەو ڕۆژەدا
تـــا وەکو ماوی لە دونیادا بکە (أحسان)ی خـــۆت
گەر نەکەی مەسئول دەبی کێ دێ جەوابی تۆ ئەدا
ڕێگەکەت دوورە عەجەب بێ باکی چۆن پێیدا ئەڕۆی
بـــــەم شەوە تاریکە بێ تۆ شەو دەلیل و بێ چـــرا
ڕوو لە قاپی حەزرەتی مەولاکــە نەجمەدین ئەتۆ
ڕوح و ماڵت صەرفی ئەو کە بەڵکو دەسگیرت بکا

## خۆر

خۆر ڕەنــگی نییە عاجز و داماوە لـــە کێوا
ئەڵبەت قەمەری ڕوومەتی تۆی دیوە لە شێوا
لا سووره مەگەر ڕوومەتی تۆی دیوە لە شەرما
ڕوو زەردە وەلـێ ناسك و نـــایابـــە لـــە سێوا
حەدی چییە نەوغونچەی گوڵ لێوی دەبزوێ
لـــەو باغە کە تـــۆ زەردەخەنە دێنییە لێوا
بیستومە زەدەی گورزی دەسی ڕۆستەمی عەشقت
بێ بـــاکە لە نێو جـــن و بـــەنی ئـــادەم و دێـــوا
ناهەق نییە (صابر) بە خـــــودا وا خەرەفـــاوە
کێ بێ( قمر)ی تەلعەتی تۆی دی کە نە شێوا

## یار ئەبێ چۆن بێ..؟

سەد مەرتەبەیی شاهی لە تۆی بەرگی قوماشا
دەرحەق بە گەدا لوتف و کەرەم لازمە پاشـــا
زامـــارم و بێچارە نەهاتی کـــە بپرســـی
حاڵت چییە ئەی غەمزەدە لەم کاولە ئاشا
عنوان و (تکبر) مەکە ئەی یاری خـــەرابات
چی (صاحب )ی عنوانە پەشیمانە لە پاشا
هەر دەستەو دوعا دیدە بە شاڕێوە نەهاتی
تەئسیری دوعا و عەهدی من و تۆ نییە حاشا

ساتێ وەرە بازاڕەوە ئەی یوسفی مـصری

عالەم بە سەر وماڵەوە هاتوونە تـــەمـاشا

ئارام و سەبووری نییە(صابر) وەکو ماسی

بێ تونە کەڕ و گێژە پەریشانە لـــە ماشا

## پایزی پیری

پـــایزی پـــیری پـــەیابوو نـەو جوانیمان نــەمـا

نـەو بەهاری عـــەیش و نـۆش وکـــامەرانیمان نــەما

شێری پیری دەست و پێی ئاسکی جوانی تێکشکاند

قـــوووەتی سەر پەنجە و بــاسك و زرانیمان نــەما

ئێمە دونیامان نەخست و ئەو هـــەمووی خستینە ژێر

ئـــیعتبار و دەســـتەلات و پـاڵەوانیمان نــەمـــا

نا خەڵەف بووین و رەوشتی باب و باپیرمان نەگرت

خوا شوناسی و ئیفتخار و خـــانەدانیمان نـــەمـــا

روو لە چۆڵی غەفلەت و پشتمان لە کەعبەی مەقسەدە

ئـــەی مـــوسلمانینە کـەلکـــی ئـاوەدانیمان نـەما

چونکە (سجادە) ی پدەرمان خستە سەر جادەی عەدو

زەوقی دیـــن و خوێندنی (سبع المثاني ) مـــان نـــەما

خاوەنی خەرمان و مێگەل بووین و روتبە و (أعتبار)

ئێستە باشاری شوانی و ئـــاشـــەوانیمان نـەمـا

دزی پیری گەنجی عـــــومری خۆشەویستمانی دزی

بـۆیە وا مـــات و کـــزین و شادمانیمان نـــەمـــا

گاور و جوو واز لە دین و مەسلەکی خۆی نایەنێ
دینی (مسلم) وا لە بەر شێتی و نەزانیمان نــەما

(دائما) دەرد و بـــەلامان زۆر و بـــێ بارانییە
موستەحەقمان بێ کە ئاوی حەوز و کانیمان نەما

ئابڕوومان وەك عەرەق ئەتکێتە جام و بادەوە
حورمەتی دینمان بە قەد چایی بەیانیمان نەما

صابری فەقر و قەناعەت فەخرە بۆ دین پـەروەران
سەد شوکر وا مـــەرتەبەی دونیای فانیمان نــەما

## خۆت بناسە

ئـــەی لـە چۆڵی غەفلەتا هـــەر ڕەوکەوانی چارەوا
ڕۆژ و شەو وردی زوبانت ئەم بەرخە وا ئەو کارە وا

ئەسڵ و نەسلی خۆت بزانە هاتوو وچونت تێبگە
بابە گەورەت حەزرەتی ئادەم (صفی ) داکت حەوا

خـــالقت کێیە أطاعەی پــێ بکە ئەی بـــێ خەبەر
حەیفە لەو عاصی ئەبی کەوتویە دوی نەفس و هەوا

خەوفی مەولا بێنە دڵ ئەی غافلی بێ عەقڵ و هۆش
تا نـــەبی ڕۆژی قیامەت تووشی دەردی بـــێ دەوا

ئەلبیسەی تەقوی لە بەر کە سونەتی پێغەمبەرە
پیاوی دانـــا دینی دانانێ لەسەر نـــان و کـــەوا

تەسویەی ڕێی خاس و عام و تەرکی ڕێگەی دین ئەکەی
ئەی (مهندس ) ئەی تەریقی خاس و عـــام و پێشەوا

تەسویەی خاشاکی ڕێگەی دین نەکەی بێ حاصلە

خۆ بە بەیداغ و عەلەم نـابی بە شێخ و پێشەوا

(صابری ) تۆ تەسویەی ڕێی دینی خۆت ناکەی ئەلێر

ئـەم مەلا و شێخە وا ئـەو جاهیل و دەروێشە و

(صابری ) وا چاکە تا ماوی لە دونیا عومری خۆت

سەرفی مەولا کەی لە مەولا تەرکی ماڵ و (ماسوی)

## سکالا

ئـەی مـوسڵمانان بـڵێن بەو دولبەرە بـۆچ وا دەکـا

"طَرفةَ العین"ێ هـەزاران فـیتنە ها بـەرپـا دەکـا

قەسدی خـوێنی بـێ گوناهان بۆچ ئـەکا ڕۆژێ هـەزار

دەستەو خەنجەر غەرقی خوێنەو سور بە سورحاشا دەکا

هێندە بێ ڕەحمە لە "عین الفعل"ی قەتلی بێ خـەتا

عـالەمێ غـەوغا دەکـا ئەو خەندەیی قاقا دەکـا

ڕەحـم و (أنصاف)ی نییە دەر حەق بە مسکێن و فـەقیر

هیچ شـەرمێ نـە لە شێخ و نە لـە شاهەنشا دەکا

چۆن نەترسم مـوفتی و قازی کە چوون بۆ خزمەتی

بە ئەقلم مەیلی لە سەر چشتێکە " أستفتا " دەکـا

تێدەگـا بـۆ لـەرز و تا – عناب–ی لێو شـافییە

بۆیە لێوی خۆی گەزیوە دەست و پـەنجەی وا دەکا

چوومە کن نەوعێ " أطبا" بۆ عیلاجی لـەرز و تا

" جملە" فەرموویانە هەر " عناب" ە دەفعی تا دەکا

شەو بە هێواشی وتــی مەگری بـــەدایم ئـــاشـــکرا
ئیش و کـــاری عاشقی لازم بـــــە "أستخفا" دەکـــا
ســـەد فغانم کرد و لێی پاڕامەوە سوودی نـــــەبوو
وەرنە سەیری جەوری ئەم "سلطانە- أستغنا" دەکا
شەرق و غەربی "أستیلا" کرد و نەما نەوعی بەشەر
زاهـــیرا عـــەزمی گـــروهی عالەمی بـــالآ دەکـــا
"صابری" کێیە لە بەحسی خەت و خاڵی دەم بـدا
جار جارێ " شبە"ی شانـــە زوڵفەکەی تـاتا دەکا

## شەوقی یار

شـــــەوقی یاری وا لە شاری سینەما
هەر دەمێ رەنگی دیگەر وەك سینەما
هەر کەسێ جارێ ببینێ یاری من
خاوەنی سەد گیسەبێ فلسی نەما
چونکە یوسف هاتە بازاڕی "مصر"
شیدەتی قاتی نەما برسی نـــــەما
بەندەکەی شوکری خودا دێنێتە جێ
وا رەقیبیش ئێسکی قورسی نــــەما
" شکرو لله" ناحیەی دڵ " صابری "
تـــــا بڵێی ئاسوودەیە ترسی نـــەما

# چاوی یار

وا دیــاره چــاوی یـــارم مـــەیلی بیمــاری دەکا

دڵ کە بێ سەبر و قەرارە شیوەن و زاری دەکـــا

بە ئەقلم بادی" صبا "ڕێی کەوتە نێوگوڵزاری ڕووی

وا کە ئیستهزا بە عەتر و مسك و تاتاری دەکـــا

هەر کەسێ جارێ ببینێ سورەتی یارم لە خـــەو

تـــا بمێنێ زکر و شوکری نیعمەتی بـــاری دەکا

هەر کەسێ هۆشیارە مەیلی یار و دڵداری دەکـــا

بێنە سەیری چاوی یارم مەیلی بیماری دەکـــا

خۆشە شەو ناڵین و جەوری یار و زامی نـــادیار

"خاصة" بۆ ئەو کەسانەی زیکری جەبباری دەکا

گفتوگۆی " صابری " بۆیە هەمووی مەستانەیــە

چاوی یاری کاروباری خەمری "خلار"ی دەکـــا

مودەعی لۆمەم ئەکەن سەد کاشکی تۆیان ئەدی

تـــــا بزانن " صابری " هاواری ناچاری دەکا

## بووکی دونیا

بووکی دونیا شوو بە مێردی جاهیل و ئەحمەق ئەکـــا
حـــەقیەتی بێزوو بە خوێنی جەرگی ئەهلی حەق ئەکا
وا جـــــەهەنەم پڕ لە جاهیل" لەهو لەعب"ی خۆی ئەکا
تێگەیشتوو بــــۆچ لــــەژێر عەباوە لێی ئێرەق ئــــەکا
ئـــــەی درێغ ئێستاکە ئـــەهلی حەق نەما ئـــەولادییان
غـــــەیبەتی دین پەروەران و کردەوەی ناحەق ئـــەکا
عالم و جـــاهیل لە مەعناو ســـورەتا فـــەرقی نـــەمـــا
چـــونکە هەردووکـــی بە بۆیاغی سمێڵی دەق ئـــەکـــا
هـــەر موسڵمانێ " قصە"ی حەق گەر لە جێگایەك بکا
جێبەجێ لەو جێگە خۆی بێ حورمەت و جێ لەق ئەکا
واعـــزێ وەعزێ بـــدا زاڵم وەکــــــو کتکی قـــەڵـــەو
گوشتی دابـــــەستوو ببینێ چاوی هەردوو زەق ئـــەکا
خـــــوانەخواستە " عالم "ێ تەعزیری جاهیلێ بکا
ئەو مەلا تووشی بەڵاو خۆی کافری "مطلق" ئـــــەکا
ئـــەی مەلا تۆ چۆلەکەی زاڵم پشیلەی مـــەتبەخـــە
تۆ نەچیتە مەتبەخی چاوی لە تۆکەی زەق ئـــــەکا
حـــــەق وتن قانون نییە ناحەق وتن بێ شـــەرعییە
شەققی شەفە " صادق "و" کاذب "نزیکی شەق ئەکا
تـــۆ دەلوبیبەر نـــــەخۆی تەئسیر لە داوێنت ئـــەکا
لا جرەم سییر خۆر رەفیقانی کە لـــووتی رەق ئـــەکا
" طالب "ی ئـــاسایشی حیفزی زوبـــانت کـــافیە
وەرنە قەولی بێ سەر و پا قەلبی ئینسان رەق ئـــەکا
"صابری " لەو ساوە تەبعی ئەهلی دونیای نـــاسیە
نە بچووکی تێگەییو نەگەورەیی ئـــەحمەق ئـــەکـا

# چاوەڕوانیی

عومرێکە گەدا چاوی بە شارێوەیە پـــاشا
سووتاوم سەری ناکەیە ئەم کاوولە ئـــاشا

ئەو رۆژە لە سەر رێگەی عەشقت کە بکوژرێم
سەیرانە تەکەبر مەکە تـــۆش بێرە تـــەماشا

کەوتومە لە بەر قاپیەکەت سائیلی رووتم
رەحمت بە مەساکین و فەقیران نییە حاشا

عینوان و تەعەدا مەکە دەربـــارەی دەروێش
هەرچەندە کە پاشای لە توێی بـــەرگی قوماشا

ئازاری دڵ و دەردی سەرم بەس بدە قوربان
چـــی زاڵم و غـــەدارە پەشیمانە لـــە پاشا

ئـــازاری دڵی "صابری" بێ چارە ئەپرسی
بێ شوبهە ئەڵێی ماسییە شێواوە لە ماشا

پیتی بێ ( ب )

## کابوسی فیراق

عیللەتی کابوسی فیراقی حـــــەبیب

جوننەتە بۆ شێخ و مەلا و تــــەبیب

چار و عیلاجی نییە سەودایی عەشق

یا بە دوعا یا بە دەوا یا بە تــــەبیب

لادە لە - خاصیەتی - " أستخروس"

هەڵگرە ئیهلیلەج و عود و صەلیب

غونچەی لەبی بۆ "مرض"م شافیە

چــارێ خودا بیکەرە باری نـــەسیب

زامی دڵی " صابری"سارێژ ئـــەبێ

گەر قەدەمێ رەنجە بکەی عن قریب

## جەنەتی رووی یاری من

جەنەت و گوڵزاری جەمالی حەبیب | دافعـــی ئازاری غەریب و تـــــەبیب
هەم لەبی لەعلی تۆ شفا بەخشی دڵ | یـــادی جەمالی تـــۆ ئەنیسی غـــەریب
رووی رجــــا ناکەمە شێخ و مـــەلا | ناچم و گوێ نادەمە (وعظ و خطیب )
سەیلی سروشکم وەکو تۆفانی نـــوح | ئـــــاگری دڵ – یجعل الولدان شیب –
زەڕە سیفەت عاشقی خورشیدی رووت | تێکەڵ ئەبێ بێ خەبەر و بێ شــەکیب
ئوجرەتی رێ حازرە ئەی جـــان و دڵ | گــــەر قەدەمی رەنجە بکەی عن قریب
(حصه) زەکاتم بدەیێ ئەی غــــەنی | ( واجب الأحسان)م و رووت و غـــەریب
زامی جگەر چی لە مەکینە و خەیات | کـــۆششـــی بێ حاسڵە پینە و تـــەریب
تا گوڵی رووی یـــار لە من غـــائیبە | حـــاڵی دڵم زارییە وەك عـــــەندەلیب
مهری رۆخی دەربکە وەی من ئـــەکەم | چەشنی زەڕە رەقس و سەمایە عەجیب
چار و عیلاجم کە لـــــە راهی خـــودا | غـــایەتی ئیحسانە بـــە کـــوێری رەقیب
یـەك نەزەری تۆیــــە عیلاجـــی دڵـــم | لاوەکـــە ئـــەی دولبەری عـــابـد فـریب
با لـــــە تەماشای گوڵی باغـــی رووت | "صابـــری"بێچارە نـــەبی بـــێ نەسیب

## بۆچی بێ سوچ و خەتا وا ئەمکوژی

ئەی قەمەری لەیل و بەرۆژ ئافتاب

عاشقی رووت بوونە کەتان و کەباب

عەکسی گوڵی روومەتی تۆی دی بەشەر

بـــۆیە سروشکی بووە عـــەینی گوڵاب

چا نییە بێ سوچ و خەتا ئەمکوژی

رۆژی قیامەت هەیە ئەکرێی حیساب

رەحـــمی خودا بێنە دڵ و بەسیەتی

نیمە تـــوانایی عیتاب و عـــەزاب

بەختی منە وەعدی تۆ نـــاکا وەفا

عەهدی تو نەبوو دوعا موستەجاب

بـــــەم دڵە بیمارەوە دەستەو دوعام

یـــەك لە هەزاران نەبوو موستەجاب

هاتە سەرینم وتی چی مەیل ئەکەی

هاتـە دەمی "صابری" جوتێ عناب

## دووری دولبەر

تۆ وەرە ئەی دولبەری روو ئافتاب
لاوەکـە بە بێ پەردە و ناز و عتاب
بێرە ســــەرینم(مرض)م تێبگە
وا لە فیراقت جگەرم بوو کەبـــاب
وا لە غەمی دووری تۆوە کــــەوتووم
نەك حوکەما" قابض" ئەکا (أجتناب)
رەحمی خودا بێنە دڵ و بەسیەتی
محنەت و دووری و فراق و عەزاب
ســــەد کەرەتم دەربکەی و دێمەوە
تۆ کە میسالی عەسەل و من(ذباب)
دەردو غەمت حاسڵی عــومری منە
وەرنە (ثواب )م نییە (عند الحساب)
عەکسی گوڵی روومەتی تۆ (باعث)ە
وا کە سروشکم بووە عەینی گوڵاب
عاشق و غەمبارم و چاوت شــــەراب
خــەستەو و تادارم و لێوت – عناب –
فەرموو ئەگەر جان و دڵت پێ دەوێ
حــــازرە(صابر) لە بۆ رەدی جەواب

## پیتی تیٚ ( ت )

# بەخێرهاتنی خۆشەویست

- جزاك الله - كـــە تــۆ هاتی بكەی سـەردانی بیمارت
شفـــات هێناوە یــەعنی میوەهـــاتـی رووی گــوڵزارت

به نووری حوسنی تۆ شمس و قەمەر بیٚ نوور و حەیرانن
غەزال و لەعل و گەوهەر سیٚ لـــە چاو و لێو و رەفتارت

لـه تــرسی بازی چاوت پــۆڕی دڵ چاری نـــەما جانا
ئـــەمیستاكه پـــەناهی داوەته جـــەناتی روخسـارت

أطباء دەردی دڵ مشكل ئـــەزانن ســـەهل و ئـاســـانه
به ئـەوراقی گوڵی حــوسنت به لێوانی شـــەكەر بـــارت

سـەلا لەو رۆژە تـــەشریفت بـچێته ســـەر نـــەخۆشانت
وەكـو زەڕە لە دەورت رەقس ئـەكەن سوتاوی دیـــدارت

تـــەماشـــە لـــە ئـاوێنه دیـــاره چـــارەیی دەردم
ئەگەر چی پێم ئەڵێن خەڵكی به لوقمان ناكریٚ چـــــارت

بفەرموو با نەچم بیٚ توشه بۆ ســـــەحرای بـــیٚ پـــایان
وە ئیللا خۆت ئـــەزانی دەبمە مـــایەی رەنـــج و ئـــازارت

بـــە قوربان نـەوبەتی ئنصافه عـــومرێكه تـــەمەننامه
ئـــیتر وەعـــده وەفـاكه با نەبم مـــەحرومی دیـــدارت

عیلاجـی زوعفی قەلبم مەیل ئەفەرمووی سەهل و ئاسانه
بـــە ئـــەوراقی گوڵی حوسنت به لێوانی شـــەكەر بارت

دوعـــا نـــاگاته گــویٚ و دەستی كـــەسێك نـــاگاته داوێنی
چ عـــالی قـــەدره یـــارەب بیٚ بـــەلا بیٚ (صابری) یارت

# هاژە هاژی سەیلی چاوم

مـــودەتێکە شـــەو ئەناڵێنم لـــــــەژێر پاسارەکـــەت
خۆت نەکردە خاوەنی خەستەی لە گیان بێزارەکەت
وا لە چاوم جــــــاریە فرمێسکی خوێن باوەڕ بـــکە
پێ نـــەما خــــەیلی خەیاڵت بێتە لای بیمارەکـــەت
تـــا خـــــەیاڵت پـــادشاهی شــــاری دڵ بـــێ(مشکلە)
قــــــاسیدی خەو روو بکاتە چاوی خزمەتکارەکەت
هاژە هاژی سەیلی چاووم پڕ بە عالەم مەوج ئـــــەدا
قەترەیە نایەتە بەر چاوت لە سەختی قــــارەکـــەت
تـــا نـــەهاتم بوو نەهاتی تـا (تەبەیيون ) بێ بـــە هات
تـــازە هـــاتی هاتنت هەیهاتە بـــۆ غـــەمبارەکـــەت
حـــەسرەتا ڕۆژێ نەهاتیتە ســـەرینم پێم بــــــڵێی
ئـــــەی غەریبی شارەکەم چۆنی لە گەڵ ئازارەکەت
ســـەبرە چارەی دەردی دووری زیکرە دەرمانی گوناە
زوو دەگاتێ حاسڵاتی ســـــەبر و ئیستغفارەکــــــــەت
(صابری) وریـــابە خۆ ئەو شۆخە وەعدەی دا بە تۆ
نەك هەمیسان ڕەنجەڕۆ بی دەردی ســــاڵی پارەکەت

## تۆران و جنێودانی بە پیلان

تـۆران و جـنێودانی بــە پیلان و سیاسەت
پێم خۆشە کە بێگانە نەزانێ بە فەراسەت

سەد جار کە بە رووی ترش و قسەی سەرد دەرم کەی
هەر دێمەوە وەك مێش بە هەنـــگوینی هەنـــاسەت

هەرچەند کە لەبەر قاپیەکەت خوار و زەلیلم
نایدەم بە هەموو روتبەی شاهان و ریئاسەت

بـــڕوانە زەوی سینە هــەموو نەخلی ئومێدە
بێ حاصڵە ڕۆژێ نەبووە جێگە پیـــــاسەت

لەنــاکاو دەسی نــایە سەر چـاوم و یـەعنی
من کێم و ئەزانم بە دەسی نەرم و هەناسەت

عـومرێکە گلاراوومە شەو تــاکو بـــەیانی
تاخەو بزرێنی بە زرەی تاس و هەیاسەت

دوا گیانمە ئاخر نەفەسە توبی و مـەولات
دەم بێنە دەمم بیکەمە قوربانی هەناسەت

عومرێکە لیباسی غەمی دووریتە لە بەرما
گۆڕین و دڕینی نییە ئەم کۆنە کراسەت

سینەم بە سروشك ئاوەڕشێن کرد و نەهاتی
فەرموو کەرەتێ ! فێنکە بۆ جێگە پیاسەت

کەوتوومە لە بەر قاپیەکەی تۆ کەڕ و کـاسم

جارێ گوزەرێ ناخەیە سەر ئەم کەڕ و کاسەت

خەڵکی گەنمی دووریەوە چۆ چووە خــەرمان

تۆ هەر لە پەرێز مایتەو (تف)لەو دەس و داسەت

هــەر دێتەوە سۆ زامی دڵی (صابری) قوربان

ئـارام و سەبووری نییە سوتاوە لــە تـاسەت

حەسرەت لە دڵم ما کە شەوێ بێیو لە خەودا

"صابر" بە خەبەر بێ لە زڕەی تاس و هەیاسەت

## نیگارا مەست و بیمارم

نیگارا مەست و بیمارم بە چاوی مەست و بیمارت
وەکو پەروانە سووتاوم بە نووری شەمعی روخسارت
بە شەو مەجنون و بێدارم بە یادی زوڵفی (واللیل)ت
خەیاڵی رووت بە رۆژ شێتم دەکا( والشمس)ی روخسارت
لە شەوقی عارزت شەمس و قمر حەیران و شەرمەندە
لە چاوی تۆ خەجاڵەت بارە ئاهو کەو لە رەفتارت
نە تەنها (صابری) گیرۆدەی زنجیری گیسوتە
دەبینم مەشرق و مەغرب پەرێشان و گرفتارت
عیلاجی دەردی (ضعف القلب) ئەگەر چی سەختە ئاسانە
بە گوڵ قەندی گوڵی روخسار و لێوانی شەکەر بارت
دەمێکە عالەمێ ئومێدەواری لوتف و ئیحسانە
کە تۆ پێیان نیشاندەی دەفعەیە روخساری گوڵزارت
کە یارم هاتە باڵینم نەما ئازار و ناڵینم
خودا لێکیان نەکا ( صابر) حەکیم و بەختی بێدارت
مەسیح ئاسا بە ئیمایە هەزار ئەموات ئەکەی ئیحیا
وەرە سەیریکە (صابر) با نەبێ مەحروومی دیدارت

# بۆ خودا

بۆ خودا دەرخە ساعەتێ ئەو گوڵی روخسارەکـەت
با بـــە کامی دڵ ببینێ بـــولبولی گوڵزارەکـەت
باوەڕت بێ وا لە چاوم سەیلی خوێنین جاریە
ئـــاموشۆ ناکا لە مەولا قافڵەی سالارەکەت
گەر دەپرسی حالی دەردی عاشقی روخسارەکــــەت
حـــالەتی بولبول تەماشاکە لە نێو گوڵزارەکـــەت
سوبحدەم بادی سەبا موژدەی وصالی دا بە دڵ
جانی شیرینم - نثار - ی پەیك خۆش رەفتارەکەت
(فارغ البال)م لە غەمزەی چاوی خوێن رێژی ئەجەل
چونکە ئەو نابێ موقابل غەمزەکەی خونخوارەکـەت
مـــودەتێکە( صابری) وەعدەی بەهاتن داوە یـــار
خـۆ نەهات ئەو بێ وەفای غەدارەکەی عەیارەکەت
سەد نەهاتی هات و سەد هەیهات هاتی تۆ نەهات
ئاخ لە جەور و زوڵمی یار و تالعی غەدارەکـــەت
مـــودەتێکە ( صابری ) یارت وتی دێم و نـــەهات
بە ئەقلم پێی خۆش نییە شەو شیوەن و هاوارەکەت

## پیتی ثی ( ث )

## شەوقی جەمالی

شـــەوقی جـــەمالی دولبـــەره یـــاماهـــــی تـــابان – الغیاث–
ســـــووتانمی ســــووتانمـــــی مـــانەنــــدی کەتتان – الغیاث–
ئەڵبەت گوڵی گوڵزارەکــــــەی روخــــــساری دیــــــوه دڵ
بۆیه دەکا بــــــولبول سیفەت گـــــریان و نــــــاڵان –الغیاث–
من چیم به سەر لوقـــــمانەوه بــــــــەم دەردی بێ دەرمانەوه
کــــە ئـــاگری نـــــەکوژایــــــەوه سوتام وەك خەرمان –الغیاث–
دەردم مــــــداوا نــــــاکـــــرێ زومــــرەی حەکیمان – الغیاث–
بێ سووده حەب و شەربەت و مـــــەعجون و لوقمان – الغیاث–
دەرمانی دەردم چوو لــــــەدەس هــــــــــاواری من ناگاته کەس
فـــــەلاحــــــی دڵ وا ئـــــاگـــــری بـــــەربو له خەرمان –الغیاث–
زامــــــاری شمشێری بـــــــــرۆی یـــارم ئـــــەرستۆ شێت ئـــەکـــا
بیمـــــــــاری چاوی دەرکــــــەوێ حـــــــەیرانه لوقمان – الغیاث–
لوقمان و جالینۆسی چــــــــــی ژنــــگـــــار و مـــــالینۆسی چـــــی
بێ سووده حەب و شەربەت و مـــــەعجون و دەرمان– الغیاث–
دەرمــــــانی چـــــــاوی (صابری) خـــاکی بــــــەری پێی دولبـــــــەره
چـــــــی بکەم کە نیمه قیمــــەتی ئیــــلا دڵ و جــــــــان –الغیاث–
(صابر)ئەگــــەر چـــــاو ئێشەته دەرمــــــــانی هەر سەبر و سکوت
وەرنـــــە لــــە دەرمــــــــــانی دڵت حـــــــــەیرانه لوقمان – الغیاث–

# هاوار

ئـــا میهرەبانی کــوشتمی ئـــەی میهرەبانان "الغیاث"

چـــار و عیلاجێکم بـکەن شێخ و حـــەکیمان " الغیاث"

دەرد و بـــــرینم کـــاریە نـــالانـــدنم بــــێ چـــاریە

بــۆ چـــارەی ئـــەم بیماریە حــــەیرانە لوقمان " الغیاث"

گاهێ بە بەدری رووم‍ـــەتی یـــار نیوە سوتم وەك کەتان

گاهێ ئەو خورشید و منیش وەك زەرە رەقـــسان " الغیاث"

داوێنی یارم چوو لـــــەدەس تـــەسکینی دڵ نایەت بە کەس

دڵ وەختە بشکێنێ قەفەس وەك عـــــەندەلیبان" الغیاث"

فرمێسکی خوێنینم نـــــە ما چــــــاوی جیهان بینم نەما

وا روحـــــــی شیرینم نـــەما چیبکەم بە قوربان " الغیاث"

(یا نـــار کـــوني مطلقا) ئـــــاگری دڵ نـــــەکوژایەوە

ئــــەم شەو دزێ وا ئـــــاگری بـــەردا لە خەرمان " الغیاث"

هـــــاوار و زاری پیشەمـــــە بــێ شك ئەڵێی چاو ئێشەمە

دەردی دەمــــار و ریشەمـــــە جــــەمعی موسڵمان" الغیاث"

نیل و فوڕاتی چـــاوی تـــــۆ خــــــەرمانی پێ ناکوژێتەوە

ئـــاوی سەبووری بێنە دەس بـــێ سوودە گریان " الغیاث"

عـــومـــرێکە واوەیلا ئەکەم هـــــەر شیوەنی لەیلا ئەکەم

"مەجنون" سیفەت وێڵی سەحراو دەشت و بیابان " الغیاث"

(صابر) لـەبـەر مەهتابی رووت بۆتە کەتانی نیوە سـووت

فـــەرموو بـڵێ نەختێ سکووت تو بیو قورئان " الغیاث"

( صـــــابر) بە گــریان و فـــغا نا کوژێتەوە خەرمانەکەت

تـا ئـاوی ســـەبری پیا نـــەکەی بێ سوودە نالان " الغیاث"

## پیتی ( ج )، ( ح )، ( خ )، ( د )

### ئەی بە شیرینی لە مەحبوبان ئەسێنی

ئەی بە شیرینی لە مەحبوبان ئەسێنی خەرج و بـــاج
وەی غولامی تۆ هەموو سوڵتانی خاوەن تەخت و تاج
ئەی بە غەمزەی چاوی بیمارت هەموو عالەم نەخۆش
وەی بـــە ئەنفاست ( شفایا بن گـــروهی نـــامیزاج)
ئەی بە نیگاهی چاوی بیمارت هەموو عالەم نەخۆش
وەی هەموو عالەم بە ئەنفاسی مــــەسیحت ئیحتیاج
تـــا لـــەسەر چاوی نەخۆشت بیٚ( طبیب) بانی بڕۆت
هــــەرچـــی تێفکـــری پەرێشان و بە لوقمان ئیحتیاج
نەقدی جان و دڵ وتم قوربانی بەر پێت کـــەم وتـــی
خـــۆ لە شاری ئێمە ناچێ شێتە نەقدی بـــێ ڕەواج
تـــا "صبا" ڕێی کەوتە ناو گوڵزاری حوسنت ئـــەهلی دڵ
نـــا خەون شـــەو تـــا بەیانی پادشاه و میر و حـــاج
(صابری) هەر چاوەڕێ بوو تۆ کە ئیفای وەعـدەکەی
هــــەر نە هاتی چاری دەردی کەی ئەناڵێ نا عیلاج

# عیلاج

ئـەی هەموو عالەم بە چاوانی نەخۆشت نامیزاج

ئینتیزارن ئەی مەسیحا لــەب بیاندەیتێ عیلاج

تۆ کە دەر کەوتی مەه و ئەستێرە شەو نووریان نەما

ڕۆژ کە مەیلت بێ لە مەحبوبان ئەسێنی خەرج و باج

بۆ غولامی تۆ بەنی ئادەم هەموو گەردن کــەچن

(جملە) دەروێش تا غەنی تا ساحێبانی تەخت و تاج

دەرد مەند و موستە مەندم تۆ حەکیمی حازیقی

تۆ بە ساغم سەرف ئەکەی حەزکەی بە نەقدی بێ رەواج

تــا دەماغی دڵ لە بۆنی جەنەتی حــوسنت پڕە

شاد و سەربەست و ( مجازم ) بۆتە داوی نـا میزاج

ئەی مەسیحا لەب بە چاوی تۆ کە روحم لێوەیە

تـۆ وەرە رەحمێکە یــا روحم بسێنە یــا عیلاج

(صابری) لەو ساوە سورمەی چاوی خاکی رێگەتە

چـاوی بینایە بە بەدری حوسنی پاکت لـەیلی داج

## نیگاهی تۆ

ئـەی نیگاهی تـــۆ شیفایی تـــەندروست و نـا میزاج

" عـــــالم الله" ئینتزارن تـــۆ بیاندەیتێ عـــــیلاج

شەو بە میوانی دڵ و ماڵی فەقیرێ خۆش بـکەی

لائیقە دەروێش و پاشای پێ بسێنێ خەرج و باج

بـــەندەگی دەرگانەکەت چاتر لـــە روتبەی شـــاهیە

بەندە فەرمانن هەموو سوڵتانی خاوەن تەخت و تـاج

وا لـــــە دووری تۆ پەرێشانم کە روحم هاتە لێو

تـــــۆ وەرە یا روحی شیرینم بسێنە یا عــیلاج

( صابری ) حەق وێژە گەر خوێنی برێژن (في المثل)

نەقش ئەکا رووی زەوی مانەندی (منصور) ی هــەلاج

# نووری جەماڵت

نووری جـــەماڵت جەلا بەخشی تەماشایی ڕوح

لێوی شەکەر بـاری تۆ "ذائق"ە بەخشایی ڕوح

پــڕتـــەوەی ڕوخساری تـۆ دیدەیی بیماری تـۆ

مـــورسی ئـــازاری تۆ " منشأ "ی غـــەوغای ڕوح

عیللەت و ئازاری من قـــەلبی بریندارى مـــــن

دیـدەیی خـونباری من شاهیدی دەعـــوای ڕوح

خەڵقی خودا ئەی پەری بۆ لـــــەبی تۆ موشتەری

هەم بە سەمەرقەندی دڵ هەم بە بـــوخارای ڕوح

دڕکـــی غـــەمی عەشقی تۆ وا چەقییە پـــای دڵ

قـــووەتی نـــووری نـــەما دیـــدەیی بینای ڕوح

تەرجەمەی ئایەتی " مصحف"ی ڕووت مـــەقسەدە

وەرنـــە ئیجازەت نییە گـــوفتنی مـــەعنایی ڕوح

یـــا بە شەکەر خەندەیی لەرزی دڵم چارەکـــە

یا بە دوو عەننابی لێو واهیمەی شـــەوتایی ڕوح

بـــاســـی ڕەنگ و ڕوو نییە عیللەتی مـــەجنوونیە

کـــاری ئـــەرەستۆ نییە "جنة"ی ســـەودایی ڕوح

" صابر "ئەگەر جان و دڵ سەرف بکەی لائیقە

بۆ" صنم "و دولبەری هەم دەم و هەمتایی ڕوح

## عەشقی پەری روویەك

لە تــــاوی ئاگری عەشقی پەری رووییەکی قـــەد بەیداخ
خودا ئاگاهە یەك لەحزە نییە جەرگ و دڵــم بـــێ داخ
کە زوڵفی رووت پۆشی سەراپا خەڵقی مەجنوونە
کە دەرخا رووی شیرینی وەکو فەرهاد ئەچن بۆ شـاخ
بـــە غەمزەی چـاوی بیماری ئـــەزانن چەند پەرێشانم
میسالی باخی بێ خاوەن وەیا بوستانی بێ چـــــەرداخ
بـــــە باڵا سەرووی بوستانە بە روخساری گـــولستانە
بە شەو " ساقی " مەستانە بە رۆژ بێ مەسکەن وسۆراخ
بە غەمزەی چاوی سەحاری مەلەك رەقس و ســەمایانە
لە شەوقی حوسنی شیرینی بەشەر کەوتۆتە شـاخ و داخ
گـــوڵی حـوسنی کە بنوێنێ بەشەر ئـــارامی نـامێنێ
وەکو بولبول ئەناڵێنێ لە شاخ و دەشت و باخ و شاخ
نیشانم دەن ئـــەگەر دیتان نیشانێکە لـــــە مـــــەردیتان
کە چونکە هیچ کەس نەیدیوە قەت ئینسانی وا گوستاخ
چ حاصڵ "صابری" هاوار ئەکەی "قاتل" لە دەس دەرچوو
هـــەتا رۆژی قیامــــــەت قاتلت پـــێ نـــاکرێ ســـــۆراخ

# بە قەسدی کوشتنم

بە قەسدی کوشتنم ئەو شۆخە وا روخساری دا پەرداخ

بــە ناچاری دەکا زاری کەسیٚ وا دەیــدەنــە بەرداخ

بـــە غەمزەی چاوی بیماری جگەر زامـار و بیمارم

بـــە شـەو ناڵان و بێدارم بە ڕۆژ خۆراکم ئاخ و داخ

گـوڵی حـوسنی کـە بنوێنیٚ بە عاشق سەبـری نامێنیٚ

بولبول ئاسا دەناڵێنیٚ بە مەحزونی لـە سـەحنی بـاخ

لە چاوی مەستی مەخمووری لە شوعلەی روومەتی سووری

نیگـەداری بـکەی رەبـی لە چـاوی پیس و(ذي أوساخ)

ئـەگـەر باوەڕ دەکـەی یـارم بە نـەوعیٚ زار و بیمارم

بە شوعلەی روومەتی یارم وەکو فەرهاد ئەچم بۆ شـاخ

لـەبـەر ئەو خـەسرەوە شیرینە ژینم تـاڵە فـەرهادی

کـە چـونکە نـاڵە ناڵم نابیە نـاچار ئـەچم بـۆ شاخ

بـەبیٚ ئـەو خەسرەوە شیرینە(صابـر) ژینی لیٚ تـاڵە

لە بەر ئەو رەنجی فەرهادی دەدا دائیم لـە کێو وشـاخ

وجـود ئـەو جـا عـەزیزە تۆ عەزیزی لای عـەزیزی بی

نـە ئـانـکی باغچەی شار و دەرو وبیٚ خاوەن و چـەرداخ

مـەناڵە (صابری) گـریانەکەت تأسیری مـەعلومـە

کە تۆ هاوار ئەکەی یار خەنجەری موژگان ئەدا پەرداخ

## گرفتارم

گــرفتارم بــه داوی زوڵفی شیرینێکی قــەد بــەیداخ
بە تەقدیری خودا نابێ دڵــــی دێوانە قەت بــێ داخ
لە کن دەرکەوتنی لەیلا دەمودەس شێت و مەجنوونم
لــە کن ونبوونی ئەو شیرینە فەرهادم لــە کێو و شاخ
دەبینی رەنگی زەردم بۆچ ئەپرسی حاڵی دەردی من
کە بێ شەوقم (مثالي ) دالیەی بێ خاوەن و چەرداخ
نــــەخۆشی سەرسەری (صابر) مەگەر چابێتەوە رۆژێ
کە تۆ پێیە بنێیە ســەر سەری کۆتابێ ئــۆف و ئـــاخ

## لەرزی پیری

ئەو کەسە وا زوڵفی خۆی و عومری ئێمەی دا بە بـــاد
هاتــــەوە خـــزمینە با ئێمەیش بخوێنین "أن یكاد"
لەرزی پیری نایەڵێ دەستم عەســـا بگرێ زەمـــان
نایە دەستم کلکی رەشمەی ئەسپە سەرکێشی موراد
"شکرو لیلا" هەرچی مەقسوودی دڵم بوو هاتـــە جێ
چاو و دڵ هەردوو بەرەو رووی یارە رووناکە و گوشاد
مـــن کە چاوم کەوتە یاری بەختیار ئـــــەوسا وتم
کامــە کامەم پێ دەکا دونیا خــودا هـــاوار و داد
چاکو و دونیا هەردوو خاتریان لە حەق یەك چانیە
بۆنی گوڵ ئازارە بۆ قالۆنچە ئەی مەردی جـــەواد

بـــا لەمـــەولا عـــومری رابـــردوو قەزا گێڕینەوە
ڕوو لە مەولا کەین و هەم بگرینەوە ڕێگەی ڕەشاد
ســـەر بڕینی نـــەفسی " أمارە" جیهادی ئەکبەرە
شێرە تەقوا نەفسە ڕێوی "صـــابری" ڕۆژی جیهاد

## تابەکەی

تابەکەی قوربان لە دووری تۆ بکەم فەریـاد و داد
تەن نەخۆش و بێ حەکیم و دڵ حەزین و ناموراد
یاخودا ئەم دەردە بێ دەرمانە تووشی کەس نـــەبێ
دوژمـــنانیشم نـــەکەی وا مـــوبتەلا - رب العباد-
دەردەدار و بێ دەوا خۆم تابعی نەفس و هەوا خـۆم
موستەحەقم بێ کەوا خۆم کردە جەوتی بەد نەژاد
چوو بەزایە گەنجی عومرم لەم مەراقە چاکە بمرم
ڕۆژ ئەڵێی سەرخۆشی خەمرم شەو لە خەودا وەك جەماد
ئـــاخ لە دەس نەفسی لەئیمە تابعی دێوی ڕەجیمە
لائیقی نـــاری جـەحیمە تابعـــی فیسق و فـــەساد
"نفس"ی ئەمارە هەمیشە خواردنی لێ بۆتە پیشە
پێم ئەڵێ قەت دامەنیشە بۆم پـــەیاکە نـــان و زاد
بۆم پەیاکە چای و شەکرە ماڵی زەیدو عەمرو بەکرە
هێندە حەییال و بـــە مەکرە ئابڕوومی دا بـــە بـاد
چا و قوبڵیم بۆ پەیاکە تەرکی ئیمان و حـــەیاکە
ڕوو لە جەردەی پادشا کە بێنە هەرچی بـاد بـاد

بێنە قاورمە بـــە چەوری پڕ پیاز و پڕ بــە دەوری
نانی گەندوم بـــێ لەدەوری گەرم و نــەرم و بێ (رماد)
مالْ و عومرم چوو بەزایە (باعث)ی نەفس و هەوایە
یــا خـــودا سا پــایە پایە بێمەوە سەر ڕێی ڕەشاد
(صابری ) پیری و فەقیری گەرچی نەقسن بۆ موجاهید
بـۆ شکاری نەفسی ڕێوی جـووتە شێرن بـــۆ (جهاد)

## پەشیمانی

نا میزاج و بێ دەوا خۆم دلْ حەزین و نــامـــــوراد
تـــابعی نەفس و هەوا خۆم گەنجی عومرم دا بە باد
غافلْ و غەرقی گوناهم عاسی و نامە سیاهم
روو ڕەشی دیوانی شاهم عاجزی (یوم التناد)
گورگی نەفسم خستە ناو (أغنام)ی عومری خۆمەوە
ڕەنجە ڕۆ خۆم وا بە جارێ عومری گەنجیم دا بە باد
موشی نەفس و گەنمی ئەعمال و کوردی دۆ نەدیوو
عەرەب و حەلوا دز و جەردە و خەراپی و فـــەساد
نەفسی بەد خوو دائیما هەر پێت ئەڵێ بێنە و بخۆ
چەور و شیرین و تورش و ئەنواعی ئاش ونان و زاد
نـە لە قەهری حەق بترسە نە لە گورز و شەق بپرسە
مـــن نەوا بمـــرم لـــە برسا عەیبە بۆ مەردی جەواد
یا خودا دینم قەوی کەی نەفس نابوود و نەوی کەی
نـــــەفس وەك مێشوولە وا بێ تاعەتم مانەندی باد

(صابری) نەفسی خەبیس و دزدەستەکی شەیتانی پیس
ڕێویە گــەر تــۆ بە شێری (صوم )بۆی دێیە جیهاد
شێری پــیری بەردەرە سەر نــەفسی ڕێــوی ( صابری)
گەر تۆ (صیاد)ی بزانە هەم شکار و هــەم جیهاد

## نامورادی

عەندەلیبی دڵ کە چاوی کەوتە غونچەی بامیداد
دائیما ویردی زوبانی بــۆتە ئایەی (أن یــکاد)
لەرزی پیری عودی سیواکی لە دەس بــەردامەوە
تازە چەرخی بێ وەفا بۆم زین ئەکا ئەسپی موراد
نــامورادی پیری کردم مــوختەسەر لێم ناگەڕێ
کامە کامەم پــێ ئەکا دونیا خودا هــاوار و داد
عومری گەنجیمان بە ( غصە)و نامورادی بردە سەر
وا لە پیری هاتە دەس سەر ڕشتەیی کــار و مــوراد
بــاوە کوژمان کردە باب و باوەژنمان کــردە داك
گەنجی عومرو حاسیلاتی ڕەنجی خۆمان دا بە بــاد
( یا ألهی)خــۆشەویستم ماری نەفسی نــەیگەزێ
چونکە تریاکی نییە ئەو زەهرە تا – یــوم التناد–
کردەوەی نا پوختە گشتی بۆ تەماعی پــــوختەیە
ڕۆژ ژیانت خوی حەیوان شەو بە خەوتن وەك جەماد
زیکر و فیکری ئەهلی دونیا نان و ئــاشە (صابری)
یەعنی چی خۆ دوژمنیشیانە لە ئــەسڵانان و زاد

یەعنی چی خۆ دوژمنیشیانە لە ئــــەسڵانان و زاد

لەم نەخۆشی بێ دەوایە دادڕەس "صابر" خودایە

هیمەتێکە پایە پایە بێمەوە سەر ڕێــــی رەشـــاد

(صابری) عــومرت بە زایــع دا ئیتر وریــاوەبــە

عومری رابردوو قەزاکە بێرە سەر ڕێگـــەی رەشاد

(صابری) دونیا لە تۆ بێزارە ئەمما مەیلی تـــۆ

هەر لە سەر ئەو ماوە بۆیە ناگری ڕێگەی رەشاد

# پیتی ذ ، ر، ز

## یاری لذیذ

جەژن و شادیمە ئەم شەو هاتەوە یاری " لـذیذ"

زیرەك و شیرین زوبان و ماهی روخساری "لذیذ"

تا بلێی خوڵقی حەسەن نازك بەدەن نادر دەهــــەن

نیم نیگاهی نازی چاوی مــەست و بیماری "لذیذ"

سورەتی گوڵ فێنکی دڵ چاوی کاڵ و لێوی ئـــاڵ

گیانی سەر تاپا بلوورە مەیل و رەفتاری " لذیذ"

چاوی بیماری حەکیمی " حاذق"ی دەرد و " مرض"

هاتن و تەشخیس و فکر و حب و ئازاری " لـذیذ"

نا کەسم سەر دانەنێم بۆ بەردە بازی رێگەکــــەی

یا نـــــەکەم روحم فیدای یاری وەفاداری " لذیذ"

هــــاتە بــــاڵینم " طبيبة " تێگــەیی دەرد و دەوام

خوا دەوامی دا " دەوا " میدا بە گوفتاری " لذیذ"

دەستی نــــایە سەر دڵم " فى الفور" ئازارم نەمــــا

هیچ کەسێ نەیدیوە بەم دەستوورە دڵداری "لذیذ"

"صابری" جەژنت موبارەك بێ حەکیمت هاتە سەر

" حبذا" بوس و کە نار و یار و شەو گاری " لذیذ"

" صابرا" شوکرانە ببژێرە لە سەر ئەم نیعمەتە

بەڵکو تا ماوی بمێنێ لەزەتی یاری "لــذیذ"

## دولبەری عیشوە فرۆش

یاری کەس نـــابێ بە یارم " حبذا" یـــاری " لـذیذ"

"غبطة"بەخشای حۆرییانە رەنگ و روخساری " لذیذ"

دولبەری عیشوە فرۆش و میهرەبـان و دڵ فریـــــب

غەمزە و نـــاز و ئیشارە و چاوی بیماری " لـذیذ"

گـوڵ عوزارە قامەتی شمشادە ئـەنـــدامی بـــلوور

دەست و پەنجەی نازك و کردار و رەفتاری "لـــذیذ"

تەلعەتی " دار الشفا "یە چاوی بیماری حـــــە کیم

حەببی ئەمساڵیشی وەك مەعجونەکەی یاری " لذیذ"

نیوە شەو بوو چاو لە خەو بوو لەب بە ترم و تارەوە

" حبذا" تـــۆران و عـــاجزبوون و ئـــازاری "لذیذ"

گوڵشەنی حوسنی شیفا بەخشی نەخۆشی بێ دەوا

ئەی خودا حفزی بکەی یاری وەفـــاداری " لذیذ"

" صابری" خۆشی لە خۆت ئەم شەو حەکیمت هاتە سەر

سەر لە بـــەر پێی دابنێ ئەتوار و ئـــەفکاری " لذیذ"

" صابری" وەسڵ و فیراق و جەور ولوتف وخار و گوڵ

تۆ هەمـــوو یەکســـان بزانە جەور و ئازاری " لذیذ"

## بە مەخسەد گەیشتن

" تعال الله" بە نووری تەلعەتی یــار
مونەوەر بوو بە جارێ چەرخی دەوار
بە حەملەی عەشقی یار ئەغیار دەرچوو
لــە شــاری دڵ نــەما بێگانــە دەییار
کە شادی یاری شیرین هاتە بــازاڕ
غەمی فەرهاد کێوی بوو بە یەکجار
خـــەرابەی دڵ کرایە بـــەیتی مەعموور
چ حــاجەت " ألتجا" کردن بـــە میعمار
فەرەح خورشید و غەم مانەندی سێبەر
کە ئەم هەڵهات و ئەو رووی کردە دیوار
ئیتر خۆش خوانە دائیم بــــولبولی روح
لە دەشتی دڵ کە بۆتە عــەینی گــوڵزار
لە جێگایەك کە بەحسی عەشقی یــارە
چــی یــاراییکە ئــاموشۆی ئــەغیار
نـــەسیمی زوڵفی عــەنبەر بــۆی یارم
خەجاڵەت بار دەکا سەد مێشکی تــاتار
ئەگەر چی سەد هەزار دەفتەر بنووسم
لە وەسفی یار کەمە بۆ عوشری میعشار
ئیتر بــا موختەسەر بــیّ نا پەسەندە
لە کن ئەربابی مەعنا کەشفی ئــەسرار
دمێکە "صابری" هەر چاوەڕێی بـــوو
گەیشتە عەینی مەقسەد ئــاخری کار

# چاوی بازی

چـــاوی بــازی تا بخوێنێ ئــــایەتی " أين المفر"

جان و دڵ بێ فەڕ ئەبن وەك كۆتری بێ باڵ و پەڕ

خۆت ئەزانی بەندەیەكم بێ گوناه و دەستــــەڵات

یەعنی چی چاو و برۆت دائیم لە گەڵ من دێنە شەڕ

تا بە نووری حوسنی تۆ رووناكە ئەرز و ئاسمان

هەر وەكو تۆفان نەما فەرقی میانی بەحر و بەڕ

تـــۆ لە سورەی "زەلزەلە" تێفكرە ئازارم مـــەدە

خەیر و شەڕ ئیفشا ئەبێ سوچم نییە میسقالە زەڕ

مـــــن لــە شمشێری برۆ و لێو گەزتنت بـــاكم نییە

شێتی سورەت هیچە تێناگا لە مەعنای نەفع و "ضر"

" ليس للأنسان ألا ما سعى"– صـــابر– وەرە

هیمەتێكە گەرچی بوویە كۆتری بێ باڵ و پەڕ

# چاو و دڵ ڕۆشن و شادە

- بحمد ألله – بە نووری تەلعەتی یـــار
کە ڕوون و شادە چاو و دڵ بە یەکجار
بە حەملەی عەشقی جانان ( ما سوی ألله)
لـــە شـــاری دڵ نـــەما (لا ریب دیـــار)
نـــــەسیمی جەننەتی حوسنی دلارام
کە پەیدا بوو بڵێ چـــی مێشکی تاتار
ئەگەر ڕۆژێ بنووسم سەد سەحیفە
هەتا ڕۆژی قیامەت وەســـفی دڵدار
تەواو نابێ وەلێ با موختەسەر بـــێ
ڕەوشتی چاك و پاکە کـــەتمی ئەسرار
قسەی بێ سەرفە ناکەم باوەڕت بێ
بە پارەی قەڵبەوە ناچم بۆ بـــازاڕ
نێك کاری لـــە بەد کاران مەحاڵە
بەدی ناکاتە خوو قەت مەردی نێککار
دەمێکە "صابری" هەر چاوەڕێ بوو
شەوێ بیستی خشەی داوێنەکەی یار

## کۆتری دڵ لە ترسی چاوت جێی نەما

تـــا بخوێنێ چـــــاوی بازت ئایەتی "أين المفر"
کۆتری دڵ لای نەما - والله - حەیاتی موستەقەڕ
تۆ لە سورەی - زەلزەلە - تێفکرە (من يعمل) چییە
بۆچی ئازارم ئـــەدەی ســـوچم نییـــە میسقالە زەڕ
ڕۆژ و شەو خورشید و مەه لاف و گەزافی زۆر ئـــەکەن
فەرموو فەرموو بابکەن هەر یەك بە لا یەك کەڕ و فەڕ
خـــۆ ئـــەزانی کـــە هـەژار و دەستەڵاتیشم نییە
پێم بڵێ وەجهی چییە چاوت ئەکا ئیعلانی شـــــەڕ
تا رموزی (مصحف)ی حوسنی لە عالەم بوو عــــەیان
ئەهلی دونیا - جملە- مەجرورن بەوی ئەو حەرفی جەڕ
تۆ کە دەرکەوتی ئەزانی چی بە سەردێ مەردومان
خۆر هەڵات تێفکرە حـــاڵی شەونم و میسقالە زەڕ
خۆت ئەزانی بێ گوناه ئازاری خـــەڵقی چـــا نییـــە
پێم بـــڵێ ئەی تۆ لە سەر چی وا لەگەڵ من دێیتە شەڕ
ئەی بە نووری حوسنی پاکت شەرق و غەرب و بەحر و بەڕ
روون و داگیرســـاوە ئـــەرز و ئـــاسمـــان و وشـك و تـــەڕ
بازی چاوت پۆڕی دڵمـــی دی وتـــی (أيـــن المفـــر)
لێی جودا بوو پوڕی بێ چارە حەیاتی موستەقـــــەڕ
ئەی لە بەر ئەو جووتە چاوی مەست و بیمارت مرم
قـــاتیلانی بێ دڵان و مـــائیلانـــی شـــۆڕ و شـــەڕ

گەر رموزی ( مصحف)ی حوسنت تەواوی تێبگا
عالمی عالەم هەموو مەجرور ئەکا وەك حەرفی جەڕ
ئەی کەوان ئەبرۆ لە بەر چی تیرە بارانم ئەکەی
چاوی تۆ خۆش (صابری) نەیما حەیاتی موستەقەڕ
( لیس للأنسان الا ما سعی ) ئەمما چ سوود
دولبەرم شابازە (صابر) کۆتری بێ باڵ و پەڕ

## لە سەفەر هاتەوە

لەسەفەر هاتەوە سەرپۆشی لە روو کردەوە باز
قەمەری تەلعەتی دەرکەوت و دڵم بوردەوە باز
بە سەلامی دڵی ئاتەش گەدە تەسکینی هات
بە کەلامی جگەری رێشمی چاکردەوە باز
ئە مە جێی سەجدەیی شوکرانە و سەردانانە
کە خودا مەرحەمەتی کرد و گەیشتم بە مەراز
(ذهب و فضة) ی جان دەرچو لە بۆتەی هیجران
نیەتی ترس و غەمی دەست و دەمی مزگەر و گاز
دڵ و جان گەر چی لە دەردو غەمی دووری دوورن
هیچ فەرقی نییە کەوتونەوە بەر غەمزە و و ناز
بە خودا هەر غەم و ئازارە چ دوورو چ نزیك
هەردوو هەر قاتلی دوڕاجە چ شاهین و چ باز
وەکو دونیا غەم و ئازارە چ بوون و چ نە بوون
مار هەر ماری زەهردارە چ کوتا و چ دراز

فەرەح و راحەتی تێدا نییە دونیا بە خـــودا
بە مەفادی خەبەری سەییدی ساحێب ئیعجاز

لە پـــــەنان و قومە ئاوی کە بەهەر کـەسێ دابێ
بە یەقین نانەکە زەهـــراویە ئـــاوی کـولــــە گاز

بە زگێ مادەری دونیا دز و جـەردەی هێنا
نە لە عەللامە ئەپرسن نە لە حجاجی حیجاز

بە خەبەر هاتـــم و زوو سەجدەیی شـــوکرم هێنا
کە هەموو زامی دڵم خۆش بووەوە کـــۆنە و تاز

غـــەرەزت یارە دیارە مەکە هاوار و فوغان
غەرەزت ماڵە بماڵەبە عــــــەبا جێگە نماز

بە خودا زەحمەتە دەروێش قەبوڵ بێت و نوێژ
کە لە بەر چاوی قبوڵی ئەکەی ئەم سوجـدە دراز

( صابری) مادەر و فەرزەند هەموو باوە کوژن
عەجەبا باوە کوژت کردووەتە مەحـــرەمی راز

## هاوار له داوی نه‌فسی پیس

( یـــا أله العالمین) و پــــادشــــاهـــی بـــیٚ نــیاز
رستگارم که‌ی له داوی نــه‌فسی پیس و حیله بــــاز
دین و ئیمانی بــه دینار و درهه‌م دا ســـه‌ر بـــه سه‌ر
ئابڕوی بردم له به‌ر ده‌رگاهـــی پــه‌تریق و پــه‌پاز
قه‌سد ئه‌کا مه‌غزی سه‌رم ده‌رکا وه‌کو ماری ( ضحاك)
لا مل و چه‌رمی بنا گوێمی هــه‌مـــوو بچڕی بـــه گاز
گاهی تیره مه‌زهه‌بی نه‌مرووود و فیرعه‌ونی هـــه‌یه
گاهی برسی مه‌شره‌بی دوڕنده وه‌ك گورگ و به‌راز
قـــازی یه فتوا ئه‌دا ئـــه‌مـــلاكی ئـــه‌یتامی عـــیراق
موفتی یه بۆ غاره‌تی ئـــــه‌موالی (حجاجی) حـــجاز
تا بلێی غه‌داره بیٚ شه‌رم و ویـــقار و بـــیٚ وه‌فـــــا
موخته‌سه‌ر خۆشه قسه‌ی نا سازه گـــــوفتاری دراز
تا وه‌کو به‌رخی ده‌ساژ و نانی شوانی نه‌فس ئه‌خۆی
سه‌د به‌لاّ بۆتۆ له پــــــارێزایه وه‌ك گورگ و بـــه‌راز
تا به گیانی جـــوجه‌لّه‌ی پیره ژنان كـــۆلاره‌بـــی
هه‌ر ئه‌سیری نه‌گبه‌تی وه‌ك كۆتری ژێر چنگی باز
تۆ كه خزمه‌تكاری نه‌فسی نزمی ئازاییت نـــه‌مـــا
لافی مه‌ردی لیٚ مه‌ده پوریٚ به خشلّ و چه‌ك مـــه‌ناز
ئه‌ی درێغا پیاوی ئـازا وا لـــه دونیادا نـــه‌مـــا
ته‌كیه چۆلّ و پڕ له ئه‌ولادی ئه‌وان ئوتێل (په‌لاز)[1]

---

[1] - ئوتێل پالاّس: یه‌كێك بووه له ئوتێله زۆر تازه‌كانی ئه‌و سه‌رده‌مه له كه‌ركوك.

داخەکەم بۆ مـــوئمینی ساغ و سەلیم و بـــــێ ریا
زۆر کەمە دەس ناکەوێ لەم وەختەدائیلا بـــە شاز
(صابری) تەن پەروەری تاکەی ئەجەل نزیکە لێت
تـــۆشەیە پـــەیداکە ئەی بێچارە بـــۆ رێگەی دراز
(صابری) تاکەی مەراقی (مطم الغازي) دەکـەی
(عارف یکفیك)ئەگەر مەیلت حەقیقە یا مـــــەجاز

## ئەی پرتەوی حوسنت

ئەی پرتەوی حوسنت کە دەکا دیدە جەلا ساز
مایـــەی تـــــەرەبی عاشقی شەیدا و نەزەر باز
وەجهی چییە ئەو دیدەیی (فتان)ە بە ئیما
هەر لەحزە دەکا سەد گلەیی و عەربەدە ئاغاز
بـــڕوانە سەما تا بە(سمك)ی عولوی و ســوفلی
مەجموعی لە دەرگاهی تۆ پابوسوو ســـەر ئەنداز
تێفکرە کـــە وەستاوە لە ئەتراف بە مـــلیۆن
کورد و عەرەب و رۆم و عەجەم ساکنی شیراز
بیمار و بـــرینداری و زەدەی چـــاو و بـــرۆتن
بێ چارە و بێ پارە و بێ هەم دەم و هەم راز
تـــۆ دولبەری نازك بەدەنی شـــۆخی شـــەکەر راز
حوسنت کە جەلا بەخشە لە بۆ چاوی نەزەر باز

چاوت کە دەکا هەر دەمە سەد غەمزە و ئاغاز

لێوت کە بە مانەندی مەسیحایە بـــە ئیعجاز

(صابر) لە گەڵ ئەم جەمعە پەرێشانە هەمیشە

دیـوانە لـــەرن دەفتەری ئـسمەندە ئـــەنن یاز

## ئازارم مەدە

ئازار و عەزابم مەدە ئەی یاری شەکەر راز

تـــا چەند عتاب و گلە ئەز ماکنی ئەز ناز

خۆت توورە مەکە سووچ و گوناهم نییە بە خوا

زشت ئـەست کە با بـــێ گوناهان معرکە ئـاغاز

ئەو جووتە برۆت داوە بە یەك چیم دەسەڵاتە

ئـان کـــیست کدام ئەست باشە کند ئـەنباز

دوختۆری برۆت دێنییە سەر چاوی نــــەخۆشت

زان ئـــەست همە خـــــلق بـــجان در زدە ئـــاواز

لێو بۆچ ئەگەزی یەعنی کە زاری مەکە (صابر)

چشمی تـــو بە مـــن گفت شب و روز بە پەرواز

## غەمم شادیە

تـــا نەوعی بشر در دوجهان چشم کند بـــاز
نەی دیوە کەسێ شانی تۆ چۆن لایقی مومتاز

تـــا شمس و قــمر بـــر فلك چـــرخ دوارست
چاوت بە مەسەل قاتلە بۆ رەند و نەزەر باز

تـــا هەست بە دورانی تو معلول و مـریض
ئەنفاسی تۆ مانەندی مەسیحایە بە ئیعجاز

تا دیر مغان ئەست پرواز زمـزمەی عـــشق
پەروانەیە بۆ شەمعی روخت عاشقی جنباز

پیش نـظرش ســــورمە کـــودا مست کـــسیرا
کەش خاکی رەهەت دیدەیی ئەو کردە جەلا ساز

تـــا ماضي حـال ئەست دگر مستقبل نیز
نامد بجهان هم چو توی مەحرم و دم ساز

ئەز غنچەی گولزاری رخت موهبتی کن
تـا بلبل بـێ چارە دڵ لا بـــەکند باز

وەجهی چییە ئەو دیدەی(غضبان)ە بە ئیما
هەر لەحزە دەکا ناز و عیتاب و گلە ئـــاغار

شەو رۆژە، غەمم شادیە، زیندان جـــینانە
لەو ساوە کە یادت بوەتە مونیس و هەم راز

(صابر) نەزەرت باز و قسەت شـــازە و لیکن
چاو و دەمی خۆت بگرە لە بەر دیدەی غەماز

پیتی ژ، س

## پەرێشانم

پەرێشانم بە تیری چاوی خوێن ڕێژ
وەکــو حــۆلی بیابانم وڕ و گــێژ
عیلاجم نــاکرێ دەردم گــرانــە
بە قورئان و حەکیمان و بە راوێــژ
ئەزانی باعیسی شەو تاو لــــەرزم
بە تا تای زولف و چاوانی گەلاوێژ
هــەتا ئومێدی مــانم بوو نــەهاتی
کە مردم بێرە سەر قەبران و بمنێژ
بە بەرزی قامەتی کۆتاهە دەستم
بەڕاستی سەرووی قەدی تالعم لێژ
نەمامی قەدی تۆ با سەوز و تەڕ بێ
لە کانی چاوی مــــن پــاراوە بینێژ
بپرسە "صابری" چۆنە لە دووریت
پــەرێشانە میسالی بەرخی لا مێژ

# چاوی گەلاوێژی

بە خۆری روومەتی چاوی گەلاوێژ

بە جارێ عالەمی گێڕا بە شەو گێژ

بە مانگی روومەت و چاوی گەلاوێژ

موسڵمانان عیلاجێ بوومە شەوگێژ

هــــەموو عـــالەم ئەسیر و زامـــدارن

بە داوی زوڵف و تیری چاوی خوێن ڕێژ

لە داوی زوڵفی دەرچوونم مەحاڵە

بە قورئان و بە لوقمان و بە راوێژ

لە دەستی زۆر مەحاڵە رستگاری

بە لوقمان و بە دەرمان و بە راوێژ

ئــــەوا کردم لە داوی زوڵفی دەرچووم

بۆ کوێ راکەم لەترسی چاوی خوێن ڕێژ

نەهاتی دەفعەیە دەردم دەواکەی

وەسێتبێ وەرە سەر قەبران و بمنێژ

لە ترم و تار و تیرت تێر نەبوومە

بە کاوی دڵ بە چاوی تۆ بــهاوێژ

بە غەمزەی چاوی دڵ تەسکینی نایێ

وەکو بیستومە بۆتە بەرخی لامــێژ

خــــودا بەختی بڵندی دا بـــە ئێوە

بە ئێمە دەستی کورت و تالعی لێژ

نەهاتیتە سەر ئەم ناساغە جـــاریٚ
کە مردم بێرە سەر گۆڕەکەم بمنێژ
مەپرسە(صابری) چۆنە لە دووریت
پەرێشانە بە وێنەی ئـادەمی گـێژ

## مەسیحا لەب

ئەی مەسیحا لەب بەچاوی تۆ عیلاجم چوو لە دەس
بـــۆ خودا رۆژیٚ نەهاتیتە ســەرینم یەك نـــــەفەس
من کە مردم دێیە سەر قەبر و جەنازەم شین ئەکەی
فائیدەی چی ئاوەڕشێنی خاك و خولٚ و خار و خەس
بولبولی دلٚ بۆ گوڵی روخسارەکەت ئەی غونچە لەب
شیوەن و زاری دەکـا هەر وەختە بشکێنیٚ قـەفەس
حەز لە یاری و تێکەڵی ئەغیار ئەکەی وەجهی چییە
دەفعەیە بۆ جانبی یارانی خۆت ناکەی هـــــەوەس
کۆمەڵی بێگانە دائیم مــەستی عــەیش و عــوشرەتن
دوور لە تۆ بۆ ئێمە هەر شینە لە جێگەی شەو چەرەس
دەستی من کۆتاه و خورما بەرز و باڵای ئەی خودا
تۆ سەبەب سازی بکەی رۆژیٚ کە خورما بێتە دەس
(صابـــری) تۆفانی چاوی پڕ بە عالەم مەوج ئـەدا
زۆر نەماوە کێوی عومری دوور لە تۆ بێنیٚ هەرەس

## چاوەکەم سەیریکە

چاوەکەم سەیریکە با خورشیدی حوسنت یەك نەفەس
دەرکەوێ بۆ عـــاشقی رووت و فـــەقیری بێ هـــەوەس
بـــۆ گـــوڵی گوڵزاری حوسنت بولبولی دڵ دائیما
(مضطرب)حاڵ و نەخۆشە وەختە بشکێنێ قەفەس
بۆ بریندارانی چاوت مەرهەمی لـــوتفت نییە
گەرچی وەستاون لە دەورت – مشتکا– و– ملتمس–
بـــۆ تەماشا کردنت جـــانا کە روحـــم هـــاتـــە لێو
ئەی (صنم) رۆژێ بفەرموو ئەم شەوی هیجرانە بەس
تەرکی عەشقت ناکرێ تەفرەم مەدە بێ هودەیە
تا لە دونیادا شەکربی دەوری ئەو دەگرێ مەگەس
چاوەکانت (غضبان) ە فەرموو روحەکەم با پێت بڵێم
واز لە هەنگوین نایـــەنێ بێ حاسڵە پاســـی مەگەس
(صابری) دەرمانی چاوت تۆزی رێگەی دولبەرە
جان فیداکارانە رۆژێ دامەنی بگرە بە دەس

## مەرحەمەت کە یەک نەفەس

ئەی مەسیحا لەب بە چاوانی نەخۆشت یەک نەفەس
مەرحەمەت کە وا پەرێشانم عیلاجم چوو لە دەس
یارەکەم مەیلی رەفیقی ناکەس و ئەغیار ئەکا
ئەی دریغا ئارەزوو ناکا ببێتە یـاری کــەس
دائما کونجی دەروونم پــــڕ لـــە خـــاری بێ گـــوڵە
قەت بە دەستی خۆمەوە نەمدی گوڵی بێ خار و خەس
بۆ جەفاکاری هەمیشە خۆی موهەییا کردووە
بۆ بەجێهێنانی وەعدە موتلەقا ناکا هـەوەس
خۆت دەزانی خۆ دەساژ و بەستنی پێ ناتەوێ
بۆ مریشك و جوجەڵە نەچارِ ناتاشێ قەفەس
خۆ لە بەد بەختی شەو و رۆژێکی خۆشیمان نەدیت
رۆژ گریانە بە شەو شینە لە باتی شـــەو چـــەرەس
کاروان دەرچوو لە شار و (صابری) تۆ خەوتوی
وا دەزانم گوێت گرانە نابیسی دەنگی جـــەرەس
بێ بەلا بی حەز لە یاری و کۆمەڵی ئەغیار ئەکەی
بۆ گروهی خۆشەویستت جارێکی ناکەی هـــەوەس
(صابری) تەعمیری نەقشی خانو مانو تا بە کـــەی
کێوی عومر و دین ئەوا هەردوو کە هێنایان هەرەس

## ئەی تەبیبی مەسیح ئاسا

ئەی تەبیب ئەی مەحرەمی راز و مەسیح ئاسا نەفەس
تۆ وەرە سەیریکە ئیحسانە عیلاجم چوو لـــە دەس
گـــوڵشەنی حوسنت بپارێزە لە ئـــاهی پـــایـــزم
مومکنە فەسڵی زمستان خۆشە شەمع و شەو چەرەس
تۆ کە سوڵتانی بپرسە حاڵی مەزڵومان چییە
وا کە وەستاون لە دەورت(مشتکا– و – ملتمس)
ئەی تۆ لوقمانی حەکیم و من نەخۆش و بێ هەوەس
بۆ خودا چارەت نەکردم وا عیلاجم چوو لـــە دەس
رۆژی شینم دێیە سەر قەبرم ئەرێژی ئەشکی سوور
فائیدەی چی کێلی قەبرم تەڕ بکەی یا خار و خەس
بـــولبولی دڵ بۆ تەماشایەکی باغی رووت ئـــــەوا
نەوعە کرداریٚ ئەکا هەر وەختە بشکێنێ قـــەفەس
دەستی ئاهم تا بگاتە دامەنی رووی زەحمەتە
سا خودایە تۆ بکە کاریٚ کـــە بیهێنیتە دەس
خـــــوا نەکا بەو رۆژە ئەو چاوانە وەرگێڕێ نـــەوا
گشت موسڵمانان وەرگەڕێن و دین لە بن بێنێ هەرەس
(صابری) رۆژ و شەوێ خۆشی لە عومری خۆی نەدی
بەزمی رۆژی ناڵە ناڵە و ئەشکی چاوی شەو چەرەس
(صابری) دونیا پەرستی و نەوجوانی تا بە کەی
غافلی تا کێوی عومرت نا گەهان دێنێ هـــەرەس

## پیتی شین ( ش )

## شیوەن کە ئەی دڵ

ماتەمە، شیوەنکە ئەی دڵ، چاوە ئەمجا بێرە ئێش
وا دلارامم ئەکا عەزمی سەفەر رێی هـــاتە پێش
ئەی رەفیقان ئیختیاری خۆم نییە کەوتوومە داوی
تۆ خودا مەنعم مەکەن یارم بە زۆر ئەمکاتە کێش
گەر بزانی حاڵی من، مەعلومە رەحمم پێ ئەکەی
گشت بە بێگانەم ئەزانن، ئاشناو قەوم و خـوێش
دڵ تەمـــای وابوو ئیجازەی ماری زوڵفی وەرگـری
ناگەهان دووپشکی ئەگریجەی هیلاکی کرد بە نێش
ناری هیجر و سەیلی چاو نەکوژایەوە نەبڕایــەوە
خۆ سروشکم وا لە هەردوو لاوە گوناکی کردە رێش
مەنعی چی دەرمانی چی مەعجونی چی لوقمانی چی
قەتعی خوێنی چاوی من ناکا خەنە و تورش و سرێش
بـــۆ دەوای ئەم دەردە لوقمان و ئەرەستۆ عــاجزن
وا جنونم ! ئیجتنابم لێ دەکەن سەد قەوم و خوێش
پیاوی سست و ترسنۆك ناگاتە مەقسەد (صابری)
چاپك و ئازا بە کەیف و مایەشا زوو کەوتە پـێش
ئـــەم سەر ئێشەی (صابری) لوقمانی عـاجز کـردووە
پێم ئەڵێن تەوقی سەرت بگرە وەسمە و (خل) و سرێش

## ئەی شاه تەماشاکە

ئەی شاه تەماشاکە لـە دەرگاهی تـۆ دەروێش
کەوتۆنە هەموو بێ خەبەر و عاجز و دڵ رێش
بۆ خاتری ئەو شەوکەت و شۆخیتە کـە عـالەم
هاتوونەتە خزمەت قەدەمت جوملە کەم و بیش
بێ بەرگ و نەوا موستەحەق و (واجب الأحسان)
هەر یەك لە وڵاتێکەوە هاتوونە کـەمەند کێش
هەر روح و دڵە بیکەمە قـوربانی بـەری پـێت
بێجگە لە مە هیچم نییە خۆ بیکەمە پێش کێش
لەم حوسنە زەکاتێ بە مەساکین و فەقیران
ئیعتاکە بە کوێرایی رەقیبانی بەد ئەندێش
بـێ جەژنی ویسالت بە خودا نەبووە و نـابێ
ئازاری دڵ و زامی جـگەر سـاکین و سـارێش
خاکی قەدەمت تا نەکەمە سورمەیی چاوم
دڵ سەبر و قەراری نییە ( وألله ) کەموبیش
مێرووله هـەموو تـالبی خـەرمانی فـەلاحـن
(لابد) لە کن بوونی عـەسەل حـازر ئـەبێ مێش
سوتاندمی لەو لا شەوە یارم ئـەگەزێ لێـو
یەعنی کە مەناڵێنە لە بەر دەرد و غەم و رێش
من سائیل و موحتاجم و تۆش شاه و ئـەمـیری
خێرێکە بە تەقلیدی ئیمامـانی لـە مـەو پێش
یەعنی قەدەمێ بێنە سەرینم کە نەخۆشم
ئیحسانە برینی جگەر و دڵ بکەی سارێش

جــانا وەرە بــا جــەژنی ویــساڵی تـــــۆ ببینم

شــادمکە نــەجاتم دە لــــە دەستی ئــەلەم و ئیش

تا زوڵفی سیاهی تۆ پــەناهی دڵـــی مـــن بـــێ

باکم نییە بێ شوبهە لە سەد ئەژدەری پڕ نیش

هەر کەس وەکو (صابر) کە زەدەی دەستی پەری بێ

مەجنونە جـــگەر خـــونە دڵ توونە جـــەفا کێش

فەرموو بە دڵ و جانەوە ئامادەیە (صابر)

جانا بە خودا بێجگە لەمە نیمە کەم وبێش

(صابر) تۆ ئەگەر عـــاشقی لـــەم دەردە مـــەناڵە

ئەو شۆخە جەفا پیشەیە تۆ دەرد و جــــەفا کێش

## ئازارت خۆشە بە گیانم

توبی یو خودا ئەی بوتی سورەت گوڵ و دڵگەش

بەندی جگەر و دڵ مەبڕە مــەیخەرە ئـــاتەش

بەو قەوسی برۆ و چاوی گەش و زوڵفی سیاهت

زامـــارم و بیمار و پــــەرێشان و مـــشەوەش

هاتـــوومە لە بـــۆ حیسە زەکاتێ لــە خــــەبەردا

وا هاتووە، قەت سائیل و مسکین مەکە بێ بەش

باوەڕ بکە ئازاری تۆ وا خۆشە بــە گیانم

عومرێکە جەفاکێشم و نابێ لە دڵم غەش

ئیفتادە و بێچـــارە و مـــسکین و زەبـــوونـــی

(صابر) خۆشە لەو یارەوە ئازار و کەشا کەش

## چاوی تۆیە لوقمانی نەخۆش

یا خودا خۆش بی ! سەعاتێ بێرە سەردانی نـــەخۆش
خۆ خودا پێی خۆشە تۆ خۆشکەی دڵ و جانی نەخۆش

هــــەر بە ئومێدم کــە تۆ بێیە سەرینم بــۆ خــودا
یـــا عیلاجێکم کەی و یا وەرگــری گیانی نـــەخۆش

عومری شیرینم بە ناڵین و نـــەخۆشی بـــردە ســـەر
خۆشی خۆشیمە کە تۆ پێتخۆشە ناڵانی نــــەخۆش

هەر سەری موویە برینێکی مــــوژەی تـــۆی پێوەیە
روو تـــــرشی ناکەم کە چاوی تۆیە لوقمانی نەخۆش

تـــا لە وێرانـــەی دڵم گەنجی غـەمت شـــارایـــەوە
بــــەردی بنچینەی نەما خــــانوی وێرانی نـــەخۆش

تا نەخۆشی عەشقی تۆ رووی کردە مەیدانی مەساف
رۆستەم و بەهرام پەشۆکاون لە داستانی نــــەخۆش

لەزەتی دەرد و غەمی عەشقت لە شاهی خــــۆشترە
چونکە تۆ پێتخۆشە شەو ناڵین و گــــریانی نەخۆش

(صابری) خاوەن مــوغازەی شاری دەرد و میحنەتە
وەرنـــــــەوە ئەی موشتەری کاڵای هەرزانی نەخۆش

## یار عەزمی شکار ئەکا

ماتەم و شیوەنکە ئەی دڵ تاکو چاوم دێتە ئێش
یار ئەوا عەزمی شکار و راوئەکا رێی کەوتە پێش
ئەقرەبا لۆمەم مەکەن ناچاریە کەوتوومـــە دوی
ئیختیاری خۆم نییە" وألله" بە زۆر ئەمکاتە کێش
خۆت ئەزانی من بە تەخویف و هەرا دوور ناکەوم
مادەێکە زەحمەتە پاس کردنی حەلوا لـە مـێش
سەد جا بە جەفا دوورم ئەکەی دێمەوە – فورا–
مانەندی دەروێش و کەریم یا عەسەل و مێش

## دولبەری سەنگین دڵ

دولبەرا رۆژی ســـــەعاتێ بێرە سەردانی نەخۆش
سونەتی " خیر الورا " یە خێرە سەردانی نـەخۆش
من لـــە دەرمانم کە لوقمان و ئــەرستۆ عــاجـزن
فائیدەی چی – ألتجا –کردن بە نامەردان و خوێش
یەك ئیشارەی کافیە لە و چاوە دڵ ئەگرینجە بـــۆچ
دەیگەزێ وەك ئەژدەها جارێ وەکو دووپشك بە نێش
دڵ بە دویا رائـــەکا بـــۆ دڵ ئـــەچم بیهێنمەوە
ئێوە بۆ مەنعم ئەکەن ناچارییە ئەی خزم و خوێش
کەوتمە دووی پاڕامەوە نەیدایەوە ئەو دولبەرە
هیچ تەئسیری نەبوو دەنگم وەکو ئاوازی مێش
یا خودا زوو بێتەوە بەڵکـو بداپێم مــەرهــەمێ
زوو بە زوو دانێمە سەر چاوەی دڵی بیمار و ئێش

داد و فەریادی زەعیفان نـــابیسێ ســـەنگین دڵـە
پادشاهی جابر و سەربەست و هەم بێ دین و کێش

دڵ لە بـــەد بەختی سەعاتێ خۆ لە غەم فاریغ نییە
بۆیە وا فرمێسکی چاوم رووەمەتی کردووە رێـــش

وا بە ماری زوڵفەکانت بەندی جـــەرگم داڕزا
دڵ هەراسانم ئەکا دووپشکی موژگانی بە نێش

ترس و خەوفی هاتوچونت جان و دڵ بەرباد ئـــەکا
حەیفە وا تۆ دڵ رەقی بێ رەحم و بێ ئاین و کێش

زامدارم و قیبلەی حاجات و دەرمـــانم ئـــەتـــۆی
-ألتجا - ناکەم بە لوقمانی حەکیم و قەوم و خوێش

خـــۆ لەبی چاری ئەوا کەوتوومە شوێنی دولبـــەرم
ئیختیاری خۆم نییە " بألله " بە زۆر ئەمکاتـــە کێش

تەرکی سەر ئاسانە ئەمما تەرکی دولبەر ناکرێ
تۆ لە دوکانی شەکەر تێفکرە سەردانانی مـــێش

ئەی رەفیقانم مەکەن مەنعم کە ناکەم تەرکی یـــار
تەرکی ناکا" صابری "میغناتیسە ئەمکاتە کـــێش

## وەعدەی کەرەمە

وەعدەی کەرەم و مەوسیمی ئیحسانە کە دەروێش
هەر یەك لە وڵاتێکەوە کـــردوتە کــەمەند کێش
کەوتونە لە بــەر قاپیەکەت تونـــــی و بــرسی
سەیرێکە هەموو " واجب الأحسان" ن و دڵ رێش
لــەو ساوە بریندارى مـــوژە و قـــەوسی بـــرۆتم
بـاکم نییە ئـــەی دۆست لە بێگانە کـــەم و بێش
هـــــەر کەس کە ترا دیدکە برادشت دل ئەز جان
بـــا ئانکە دوو ئابــــــرۆی تـو گـــویند میندیش
روحم چووە لەو شۆخە کـــەوا لێوی گـــــەزیوە
یەعنی کە مەناڵێنە لە بەر دەرد و غـــــەم و ئێش
هەر کەس کە زەدەی دەستی پەری زادەیە(صابر)
مەحزوونە دڵی توونە بێ ئـــــارام و ســـــەر کێش

## پیتی ص ، چ ، گ ، ع
## بۆیە کەس رزگاری نابێ لە زولفت

بۆیە کەس ناکەی لە حەلقەی زولفی زنجیرت خەلاص

تێگەیشتی حاکمی هەرچی ئەکەی ناکرێ – قـصاص –

تیری غەمزەت رۆستەم و بەهرامی کوڕی کرد ئەسیر

قەوسی ئەبرۆت بێگومان عاجز ئەکا سەعدی وەقاص

خوا جەفای قابیل بە من دی بێ وەفایی دا بە تۆ

صابرم گەرچی لە ژێر باری جەفا نابم خـــەلاص

دڵ بە شەمعی رووت وەکو پەروانە سوتا فەخر ئەکا

دوکەڵی هەر دوو لە هاتوچوونە مـــانەندی – رقاص –

یـــار ئـــەگەر لێم دوورە ئـــازاری فیراقی ئـــەمکوژێ

یا بە وەسڵی گیان ئەدەم مەعلومە گیان ناکەم – خلاص–

شـــەمعی روو هەڵکا بە جارێ عالەمێ پـــەروانەیە

گێژ و بێ ئارامە شەو تاکو بەیانی وەك – رقـاص –

عاشقی و دانانی سەر شایستەیی هەر کەس نییە

کێیە بۆ دوڕ دانە تەرکی سەر بکا ئیلا – غواص–

" صابری" دوڕ دانە داپۆشە لە سەر خۆشی عەوام

گەوهەری خۆت دەرمەخە ئیلا لە بەر چاوی – خواص–

هـــایوو هویو پرچ و ریش و تەپڵ و دەف بێ "حاصل"ە

حوسنی نیەت و عەمەل تەوبەی نەسوح ئەتکا "خلاص"

تاکو تەرکی سەر نەکەی دەستت بە مەقسەد ناگەیێ

هەر وەکو بیستوتە " صابر" گەوهەری دەستی "غواص"

## غواص

ئەی جیهانی زەڕەیی خورشیدی حوسنت عام و خاص

عاجز و پێکاوی غەمزەت رۆستەم و سەعدی وەقاص

تۆ کە لەیلی ئاگرت بەردایە دڵ مەجنوونی خۆت

بۆیە وا ئێستاکێ دەمبینی وەکو دوکەڵ " رقاص"

تا نەسوتێنن لەشی خۆیان هەوادارانی رووت

شوبهی پەروانە لە خەوفی عەشقی تۆ نابن "خلاص"

دوڕ و گەوهەر کێ لە قوڵیی بەحر و دەریا دەری ئەکا

تانەکەن تەرکی وجود و" مالملك" نەوعی "غواص"

" صابری" دوڕ دانە داپۆشە لە بەر چاوی عەوام

کێ لە قیمەت دوڕ و گەوهەر تێدەگا ئیلا "غواص"

ریش و پرچ و هەم عەمەل ناتباتە جەنەت تێبگە

تەوبەیی خاڵیس مەگەر بتکا لە (نارألله) " خلاص"

واز لە سەرهێنان و بۆ گەوهەر لە بەحرا غەرق بوون

" صابری" نایێ لە دەستی هەر کەسێ، ئیلا "غواص"

## ئەو شۆخە

ئەو شۆخە کەوا موسحەفی عوسمانە بە "عارض"

عیسا نەفەس و یوسفی کەنعانە بە " عارض"

خورشیدە بە خاسیەت و لوقمانە بە حیکمەت

ئارام و شیفا بەخشی دڵ و جانە بە " عارض"

شمشێری برۆی فاتیحی سەد خەندەق و خـــەیبەر

حەیدەر سیفەت و رۆستەمی داستانە بە " عارض"

نا حەق نییە گوڵ غەرقی عەرەق بێ لە بەرەو رووی

یارم کە ئەڵێی" روضە"یی- رضوان- ە بە "عارض"

چاکانی جیهان نازی ئەکێشن بـــە دڵ و گیان

ناز پەروەر و ئەسکەندەر و سوڵتانە بە"عارض"

سـایەی لە سـەری خەڵقی جیهان لا مەدە (ربی)

پڕ مەنفەعەت و حیکمەت و دەرمانە بە "عارض"

( صابر)بـــە دەوا دەردی دڵی چاکەوە نـابێ

ئیلا بە کەسێ حەزرەتی لوقمانە بە" عارض"

* * *

ئەو شۆخە کە ئارامی دڵ و جانە بە "عارض"

تەفسیری هەموو سورەیی قورئانە بە"عارض"

غەرقی عەرەقە میسك لە بەر زوڵفی عـــەبیری

پەژموردە دەکا سونبول و رەیحانە بە " عارض"

مەعنای روخی حورە کەوا شەرحی کراوە

بنوارە کە مەجموعی نمایانە بە " عارض"

شەرمەندە دەکا" سەروو" ـبە بـالآیی بڵندی

" ماحی" بە شوعاعی مەهی تابانە بە "عارض"

کەی دێ بە سەر ئەم خەستەی بێچارە خـودایە

ئەو خونچە لەبە شەربەت و دەرمانە بە "عارض"

موره بـــەکەمەر، لەعــلە بـــە لێو، سەرووە بـــە بـالا
بێچووە ئاسکە بە چاو "روضە"ی -رضوان -ە بە "عارض"
دەرکەوتنی مایەی فەرەحی خــاس و عـــــەوامە
سەرداری هەموو لەشکری سوڵتانە بە "عـارض"
بۆ چیمە دڵ و جانم ئەگەر نەیکەمە قوربان
یارم کە ئەڵێی یوسفی زیندانە بە " عارض"
دەرکەوتنی بێ هۆشییە، ون بوونی نەخـــۆشی
تەسکینی شیفا بەخشی نەخۆشانە بە "عـارض"
" صابر" کە پەریشانە ئەسووتێ بە شەو و ڕۆژ
زوڵفی شەوە یا میهری درەخشانە بە "عـارض"[1]

## سۆفی

سۆفی دەبێ لەوحی دڵی سادە و سپی بێ شیبهی " بط"
ئەوسا رموزی موسحەفی رووی یاری تەفسیرکا بە "خط"
ئەی موستەعید دەرسێ لە عیلمی عەشق ئەگەر تەحسیل ئەکەی
یەکســـەر عــلوم و دەفتەر ی "أثنی عشر" هاویتە -شط-
بۆ دەرسی دین ناکەیتە بەر ئەی جێ نوشینی پێغەمبەر
برسیتە وەك " جوع البقر"هەر نانە ئەیخەیتە ناو "سبط"
تۆ " باغظ"ی مورشید مەبە عەیبە لە گەڵیان زید مەبە
تا حوبی دەروێشت هەیە رێگەی خودا نـــاکەی "غلط"

---

١ – عارض: واتە دەمو چاوو ڕووی مرۆڤ .

چاك پەیڕەوی عالم ئەكەی هەر كاتبی زاڵم ئــــەكەی

هەر چاوەڕێی چاڵم ئەكەی لێدەی بە گوفتاری" سقط"

عەقڵت لە نحوا سەرف ئەكەی(حفظ)ی كەلام و حەرف ئەكەی

بیٚ دەرسی عەشقت پیٚ بڵێم علمێكە بیٚ حــەرف و "نقط"

تا تۆ خەریكی غەیبەتی بیٚ ئیعتبار و هــــەیبەتی

گەر تالبی ئاسایشی خامۆش و " صابر" بە -فقط-

## بەو موسحەفی حوسنت قەسەم

بەو موسحەفی حوسنت قەسەم بیٚ عەیب و شاذ و بیٚ "غلط"

ئەگەرچی چوارن مـــــوجتهید تەفسیری نازانن بە"خــط"

گوڵزاری حوسنی تۆ ئیرەم دڵ بولبول ئاسا " لاجرم"

زاری دەكا ئەی " ذو الكرم" ناچێتە ئەو گوڵزارە "قط"

نەوعیٚ بەشەر لەیل و نەهار گەرچی دەكەن مەیلی شـــــكار

"صید" و نەچیری تۆن ئەگەر پێیان نیشاندەی خاڵ و "خط"

ڕۆژیٚ وتم ئەی غونچە لەب مەقسوودی دڵ كەی دێتەجیٚ

فەرمووی مەگەر وەختیٚ كە خوێناوی سروشكت بیٚ بە"شط"

(صابری)بەسە گفتوگۆ تێكەڵ مەكە هەردوو برۆ

گەر تالیبی یاری برۆ لادە لە گوفتاری "سقــط"

# سالیک ئەبێ دڵی پاک بێ

سالیک دەبێ لەوحی دڵی سادەو سپی بێ شوبهی "بط"

ئەوسا دەبێ سیڕی خودای تێدا بنووسن "خط به خط"

ئەی موستەعید ئوستادی تۆ بەو جوملە بەحری عیلمەوە

چونکە سیڕی عەشقی نەبوو بەو عیلمەوە خنکا لە "شط"

هەر کەس –سماع– ی مەدرەسەی عەشقی حەقیقەت تا نەکا

تـــەرکیبی ئەشیاکەی دەکا بێ عەیب و نـــوقسان و "غلط"

نەحوت هەموو مەحویەتە سەرفت غەم و بێ سەرفییە

ئاداب و –منطق– دەر ئەخەی ناکەی بەیانی عەشق "قط"

گەر تۆ موسڵمانی لە سەر رێگەی شەریعەت لا مەچۆ

روح و سەر و ماڵت هەموو سەرفی مەولات بکە "فقط"

شەخسێ حەکیمانە وتی رۆژێ بـــەجێ دێ کـــامی دڵ

وا شیوەن و زاری بکەی فرمێسکی چاوت بێ بـــە "شط"

ناحەق نییە نەوعێ بەشەر دێوانە وا رو بـــێ خەبـــەر

کەوتوونە کێو و دەشت و دەر دیویانە حوسن و خاڵ"خط"

لەو مەدرەسەی پڕ وەسوەسە سی ساڵە کەسبی عیلم ئەکەی

مانەندی (طفل)ی ئەبجەدی ئەرکان و رێی دینت "غـلط"

ئاداب و عیلمی هەندەسە هەر (قیل وقال)ە و وەسوەسە

تۆ وەرگرە لەم مەدرەسە دەرسێکە بێ حەرف و"نقط"

(صابر) بە یـــار و ئاشنا چـــاو و دڵـــی بـــوو رۆشـنا

حـــەمد و سەنا " یاربنا"لێم دوور نەبێ ئەو یارە "قـط"

(صابر) ئەگەر تۆ ئارەزووی دەرسی ئەدیبی عەشق ئەکەی
عیلمێکە قەت حەل ناکرێ بێ حەرف و ئیعراب و "نقط"

(صابر) چییە هاواری تۆ پێی خــۆش نییە دڵداری تــۆ
گەر هەر زوبانە یــاری تــۆ لادە لە گوفتاری "سقـط"

زۆر کـــەس بە تەحمید و سەنا چـاوی دڵی بوو رۆشنا
(صابر) ئەبێتە ئاشنا دوور نــاکـــەوێ لەو یارە "قــط"

## رۆژ و شەو

رۆژ و شەو "شمس و قمر"لەو حوسنە وەرئەگرن "شعاع"
دولــبەرا تــا "کل سر جــاوز الأثنين شـاع "

روو مە پۆشە سەر زەمین تاریکە بێ خورشیدی رووت
ئەی جەمالی بێ نەزیرت حیکمەتی مــەحز و "نفاع"

یادی حوسن و عەشقی چاوت هەم حەریف و هەم شەراب
کافیە ئیتر لە ســەر مــوڵکــی جیهان نــاکـەم نیزاع

چونکە " دار المحنه" و دون پەروەرە ئــەهلی هــەموو
ناکەس و بێ شەرت وبەد خوو دین فرۆش و پــڕ تەماع

دوژمنی دونیا لە گەڵ ئەهلی شەرەف نــاحەق نییــە
تەبعی دونە وەك "جوعەل" دەگرێ لە بێنی گوڵ " صداع "

هەر کەسێ "فضل" و هونەر دەرخا لە بازاری جــیهان
پێی ئەڵێن یاساغە سەد لیرە جەزای خـاوەن "مــتاع"

(صابری) گــەر عــاقلی تێکەڵ بە دونیای دون مــەبە
مەرحەبای ئەو زەهرە، تۆ پەیداکە تــریاکـــی "وداع"

# تۆ روحی

ئفتاب أز روی رخـــــــشانی تـــو میگیرد شعاع

"لاجرم" بـــــلا نوشینت جیهان گـــیرد "نفاع"

کائینات ئەمڕۆ غولامی تۆ بە جان و دڵ ئەکەن

چونکە تۆ روحی عالەم تەن " أطعنا" ئەی "متاع"

تۆ کە غائب بی ئەمن ناچار ئەکەم مەیلی گرین

خۆر کە گیرا "عالم ألله" دێنـە گریان و فیزاع

لەزەتی دونیا هەموو زەهراویە سەر تا قـــەدەم

(صابری) خۆت لادە گـــەر بووی بە خاوانی "متاع"

## پیتی غ، ف، ق، ك، ل

### عەشق پیری کردم

پیری کردم دەرد و زامی عەشقی جانان ئەی درێغ
توشی من بوو داستانی پیری کـەنعان ئـەی درێغ

مەحرەمێ دەس ناکەوێ شەرحی غەمی دڵ "بالتمام"
پێی بڵێم بەڵکو دەواکا دەردی هیجران ئـەی درێغ

بولبول و گوڵ شەمع و پەروانە هـەموویان پێکەوەن
من وەکو یوسف بە تەنها حەپسی زیندان ئەی درێغ

دڵ بە دوتا هات و چاودێری کـە یا بینێرەوە
با نەفەوتێ میحنەتی کێشاوە بۆمان ئەی درێغ

داد و فەریادم لە لای ئەو شۆخە تەئسیری نییە
گەرچی فرمێسکم جیهانی کردە تۆفان ئەی درێغ

تا بەکەی قوربان بناڵێنم لـە نـاو "بيت الحزن"
بۆنی جامەی تۆ نەهات بۆ نووری چاوان ئەی درێغ

مەحرەمێ دەس ناکەوێ ئازاری دەردی پێ بڵێم
ڕۆژ و شەو یار و حەکیمم بۆتە گریان ئەی درێغ

ئەم هەموو گریانە یا (رب) بۆچی تەئسیری نەکرد
شیوەنم مانەندی تۆفان خەڵکی شێوان ئـەی درێغ

"صابری" لا تقنطوا" موژدەی تـەواوی دا بـە تۆ
حەیفە قەلبت "مطمئن" نابێ بە قورئان ئەی درێغ

